سەرنووسەر: **د. مارف خەزنەدار**

سکرتێری نووسین: **د. عەبدوڵلا یاسین ئامێدی**

## دەستەی نووسەران

**د. محەمەد نووری عارف**

**بەدران ئەحمەد حەبیب**

**د. بایز عومەر ئەحمەد**

**محەمەد حەمە باقی**

**محەمەد عەلی قەرەداغی**

چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ـ هەولێر

ژمارەی سپاردن: ٥٣٢

## ناوڕۆك

# پێشەکی و روونکردنەوە

لە دوادواکانی ساڵی ٢٠٠٠دا کۆڕی زانیاری کوردستان دامەزرا. بەر لەوە، سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیرانی حکوومەتی هەرێم، ئەرکێکی زۆری کێشا و پێوەندیی بەژمارەیەکی تەواو لە شارەزا و پسپۆڕانی ناوەخۆی هەرێمی کوردستان و دەرەوەی کرد، تاوەکو لە پرسی دامەزراندنی کۆڕدا پرس و ڕاوێژیان پێ بکات. هەروەها ڕاستەوخۆ و یەکەیەکە داوای هاوکاری و بەئەندامبوونی لە کۆڕدا ئاراستە کردن.

ئەو کاتە، تەنیا دە کەس بەدەنگ ئەم داوایەوە چوون و بڕیاری هاوکاری و کارکردنیان لەم دەزگایە دا. هەرچەندە زۆربەی ئەوانەی داواکەی سەرۆکایەتیی حکوومەتیان پەسند کرد، هەلومەرجی تایبەتی ژیان و کار و پیشەی خۆیان هەبوو، بەڵام بەپیرەوەچوونی ئەم داخوازەیان بەئەرکی سەرشان و کارێکی پیرۆزی نەتەوەیی زانی.

کۆڕ لە هەلومەرجێکی سەختی کوردستاندا دامەزرا. ئاسۆی سیاسی تاریك و لێڵ بوو، بارودۆخی ئابووری نالەبار بوو، کوردستان لە ناو کۆمەڵێك گەمارۆدا ژیانی بەسەر دەبرد. ئەمە وێڕای ناکۆکی و ناتەبایی ناوەخۆ، کە هێشتا باڵی کێشا بوو. گەلێك کەس لەوانەی لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان بوون، یان لە بەشەکەی تری هەرێم بوون پێوەندییان

پێوە کرا، بەڵام بەدەنگەوە هاتنی ئەم داوایە بڕوای پتەو و قوربانیدانی لێ دەویستن.

دوای دامەزراندنی کۆڕیش، ئەنجومەنی کۆڕ بەشێوەیەکی فراوانتر ئەم جۆرە پێوەندی و تێکەڵییانەی دووبارە کردەوە و بەدرێژاییی شەش ساڵی رابردووش لەسەری بەردەوام بوو. کۆڕ بەشێوەیەکی چڕ و فراوان داوای هاوکاری و پشتیوانیکردنی ئاراستەی ژمارەیەکی زۆر لە پسپۆڕ و شارەزایان کرد. بەڵام هیچ بەهیچ نەکرا. ساردییەکی گشتی هەبوو لەوەی هاوکاری و پشتیوانی لەم دەزگایە بکرێ.

ئەوەی راستی بێ، بەشێکی ئەم هاوکاری نەکردنە بەهۆی هەلومەرجی سیاسیی کوردستانەوە بوو، کە لە پێشەوە ئاماژەمان پێی دا، بەڵام بەشەکەی تری بەهۆی بارودۆخی تایبەتی کۆڕەوە بوو. کۆڕ نە باڵەخانەی هەبوو نە بودجەیەکی ڕێکوپێك کە بشێ کاری پێ بەڕێوە ببرێ و نە پاداشتێکی بەرز بۆ ئەندامەکانی و نەپاداشتێکی شایەنیش بۆ ئەوانەی هاوکاریی لەگەڵدا دەکەن.

ئەم بارودۆخە چەوتە، بەشێوەیەکی گشتی هەموو ماوەی خولی یەکەمی کۆڕی گرتەوە. وێڕای ئەوەی سەرۆکی ئەو کاتەی کۆڕ د. شەفیق قەزاز بەهۆی سەرقاڵبوونی بەکاروباری وەزارەتەکەی و گەشتە دووردرێژەکانی بۆ دەرەوەی وڵات و، نەبوونی شارەزایی لە کاروباری زانستیی کۆڕدا، بۆشاییەکی لە دەسەڵاتی کۆڕ دروست کردبوو. ئەم بەڕێزە هیچ خەم و خولیایەکیشی بۆ کۆڕی زانیاری کوردستان و ئەرکەکانی لە خەیاڵ و هزردا نەبوو. نەشیدەتوانی بەشێوەی دیموکراسی

هەڵسوکەت بکات و دەسەڵات بەدەستەی سەرۆکایەتیی کۆڕ، یان جێگری سەرۆکی کۆڕ بدات لە ڕاپەڕاندنی کاروبارەکاندا. کورتەی قسە، کۆڕ لە خولی یەکەمیدا دەزگایەکی دەستەپاچە و کەس بەدەنگەوە نەهاتوو و بێ خاوەن بوو. تەنانەت زانکۆکانی کوردستانیش دانیان بەکۆواری ئەکادیمیدا نەهێنا، بەمەش بوون بەڕێگر لە بەردەم پێشوەچوون و ڕێکوپێك دەرچوونی ئەم کۆوارە.

لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٤دا ئەنجومەنی کۆڕ دەبوایە بەپێی یاسا هەڵبژاردنی دەستەی سەرۆکایەتیی خۆی ئەنجام بداتەوە. یاسای کۆڕ داوا دەکات هەر چوار ساڵ جارێك هەڵبژاردنی دەستەی سەرۆکایەتی بکرێتەوە. لەم هەڵبژاردنەدا کە لە ٢٠٠٤/١٢/٢٥ دا ئەنجام درا، دەستەی سەرۆکایەتی گۆڕا و سەرۆکی پێشووی کۆڕ لە کۆی ١٣ دەنگ تەنیا ١ دەنگی هێنا. دوای ئەمە، جگە لەوەی ئەو بەڕێزە بۆ ماوەی ساڵێکی ڕەبەق پێی لە کۆڕ بڕی و لە هیچ کۆبوونەوە و چالاکییەکدا بەشداریی نەکرد، لەهەمان کاتیشدا کەوتبووە پێوەندیگرتن بە هەندێ نووسەرەوە، تا لە پشت کۆڕەوە، لیستێکی تر بۆ پێکهێنانی "کۆڕ"ێکی تر، لە جێی کۆڕی زانیاری کوردستان دروست بکاتەوە. بەڵام ئەنجومەنی کۆڕ هیچ هەڵوێستێکی نەرێنیی لەم بارەیەوە نەنواند و بەگیانێکی سپۆرتانە مامەڵەی لەگەڵدا کرد، هەرچەندە بەگوێرەی یاسای کۆڕ هەر ئەندامێکی ئەنجومەن ئەگەر بێ بیانوو لە سێ کۆبوونەوەدا لە کۆڕ داببڕێ، مافی ئەندامەتیی لێ دەسەنرێتەوە. نەك هەر ئەمە بگرە کۆڕ بەڕێکوپێکی پاداشی ئەو بەڕێزەی بۆ ماڵەوە بۆ بەڕێ دەکردە. دوای ئەمەش لە

مێژووی ٢٠٠٦/١/٩ دا بەشێوەی نووسراو دەست لەکارکێشانەوەی خۆی بۆ ئەنجومەنی کۆڕ نووسی. شایەنی بیرهێنانەوەیە، ئەوەی بەویستی خۆی دەست لەکاری کۆڕ بەربدات بەپێی یاسا ناشێ جارێکی تر ببێتەوە بەئەندامی کۆڕ.

کۆڕ لە خولی دووەمدا بووژانەوەیەکی لە کار و چالاکییەکانیدا بەخۆیەوە بینی. چەند کۆڕ و کۆبوونەوەیەکی بۆ پرسگەلی سەر بەزمانی کوردی گرێ دا. لێژنەکانی کۆڕ بەگورج و گۆڵییەکی زیاترەوە کەوتنە چالاکی نواندن. هەروەها ژمارەیەکی بەرچاو لە بەرهەمی ئەندامانی کۆڕ و شارەزایانی دەرەوەی کۆڕ بەچاپ گەیەنران و ژمارەیەکی تریش کە نزیکەی (٢٠) کتێبن ئێستا ئامادەی چاپن و بەم زووانە بەرچاوی خوێنەران رووناك دەکەنەوە. بەڵام ئەم چالاکییانە بەهۆی دەسکورتیی کۆڕەوە لە سنوورێکی تەسك و بۆ ماوەیەکی کورت بەردەوام بوون.

بۆیە، ئەوەی بۆ دەستەی سەرۆکایەتی و ئەنجومەنی کۆڕ جێی نیگەرانی بوو ئەوە بوو کۆڕ لە خولی دووەمیدا پاڵپشتییەکی ئەوتۆی لە لایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە لێ نەکرا. ئاخۆ دەزگایەکی وەکو کۆڕ چۆن دەتوانێ بێ هەبوونی بودجەیەك، چالاکی ئەنجام بدات! ئەنجومەنی کۆڕ لەو ماوەیەدا نەیتوانی هیچ وەڵامێکی ماقووڵی لەبارەی هۆی ئەم پەراوێزخستنەوە دەست بکەوێ، یان وەڵامێکی ئەو خەڵکە بداتەوە کە گلەیی لە نەکارەیی و بێ بەرهەمیی کۆڕ دەکەن. ڕەوشی هاوکاری نەکردنی داوودەزگاکانی تریش بۆ کۆڕ، بەتایبەتی زانکۆکان هەروەکو خۆی مایەوە و هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهات. بەکورتی هەموو بایەك

بەپێچەوانەی ویستی ئەنجومەنی کۆڕەوە هەڵیان کرد تا کار گەیشتە ئەوەی داوای دەست لە کار کێشانەوەی لێ کرا.

ئەنجومەنی کۆڕ، بەڕەوشت بەرزییەکی بێ وێنەوە وەڵامی سەرۆکایەتیی حکوومەتی هەرێمی کوردستانی دایەوە، کە داوای دەست لە کار کێشانەوەی بەکۆمەڵی لە ئەندامەکانی کرد. لە راستیدا حەزمان نەکرد کۆڕ بکرێت بەقوربانی بەرژەوەندی تەسکی حزبایەتی و کەسایەتی. بۆ هەموو کەس ئاشکرایە ئەو پرۆسەیەی ماوەی ساڵێکە لە کوردستاندا دەستی پێ کردووە، پرۆسەی یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەکەیە و هیچ دەزگایەك هەڵنەوەشاوەتەوە. واتەی چییە کۆڕ هەڵبوەشێتەوە! کۆڕی زانیاری کوردستان تاکە دەزگایەکە هیچ بۆن و بەرامەیەکی حزبیی لێ نەهاتووە و ئەنجومەنی کۆڕ ڕەنگە تاکە دەستەیەك بێ لە ناو هەموو کورددا، کە خۆشەویستی و تەبایی و ڕێز لە یەکگرتنێکی بێ وێنە، هەموو ئەندامەکانی بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە. ئەوەی شایەنی ئاماژە پێدانە لێرەدا، ئەندامێك لە ئەندامەکانی کۆڕ ئەم دەست کێشانەوە بەکۆمەڵەی ئیمزا نەکرد و ئەم سەرنجەی نووسی: "بۆئەوەی داوای لەمن کردووە ئیستیقالە بکەم دەڵێم ئەو دەسگایەی من کاری تێدا دەکەم ئیستیقالەی تێدا نییە، ئەوەی دەیەوێ من لەوێ نەبم دیارە دەسەڵاتی ئەوەی هەیە من لابەرێ".

ئەنجومەنی کۆڕ، لە ماوەی دوو ساڵی لەمەوپێشەوە خۆی بۆ ڕەوشی یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەی هەولێر و سلێمانی ئامادە کرد. ئەوە بوو پێشنیازێکی دا بەسەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیران بۆ ئەوەی لە لایەنی

خۆیانەوە داوا لە پەرلەمانی کوردستان بکەن تا لە یاسای کۆڕدا ژمارەی ئەندامانی ئەنجومەنی کۆڕ لە ١٥ ئەندامەوە بکرێت بە ٢١ ئەندام. لەمەشدا نیاز ئەوە بوو دەرفەت برەخسێ بۆ ئیدارەی ئەولا تاوەکو ٨ ئەندام بخاتە پاڵ ١٣ ئەندامەکەی ئێرە، بەمەش کۆڕ لە دەسکاریکردن بپارێزێ. ئەوەی لە خەیاڵدا نەبوو بڕیاری هەڵوەشاندنەوە بوو.

بەداخەوە ئاسنی ساردمان کوتا. کۆڕ هەڵوەشایەوە و بێ هیچ بیانوویەکی بەجێ ئەندامەکانی بەڕێ کران. ئەو ئەندامانەی کە مەردانە ڕۆژێ لە ڕۆژان بەدەم داوای حکوومەتی هەرێمی کوردستانەوە چوون و هاوکاریی دامەزراندنی ئەم دەزگا پیرۆزەیان کرد، پێچەوانەی ئەوانەی دژی دامەزراندنی بوون. ئەمڕۆ هەندێك لەوانەی تا دوێنێ دژی هاوکاریکردنی کۆڕ بوون، هەلیان بۆ ڕەخسا زەبری کاریگەری تێ بسرەوێنن.

لە کۆتاییدا، ئێمەی ئەندامانی کۆڕ، بەوپەڕی لەخۆبووردن و دڵسۆزییەوە ئەو ئەرکەی خرابووە ئەستۆمان، ڕامان پەڕاند. کەسمان بەهیوای پاداشت و بەرات و دەسکەوت نەبووین، بەئیمکاناتێکی بچووك و هەلێکی بەرتەسك، کە بۆمان ڕەخسا بوو ئەوەی پێمان کرا درێغیمان لێی نەکرد. بەڵام چاوەڕوان نەبووین بەشێوەیەك بەڕێ بکرێین کە شایانی ئێمە نەبوو.

**دەستەی نووسەران**

# ئەدەبی بەراوردکاری و پەیدابوونی لای ئێمە

**مارف خەزنەدار**

**پێشکێشە بۆ مامۆستا و قوتابیانی**

**بابەتی ئەدەبی بەراوردکاری لە زانستگاکان دا.**

## پێشەکی

لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٨٤ لە زانستگای عەننابەی وڵاتی جەزائیر ئامۆژگای زمان و ئەدەب کۆنگرەیێکی گێتی بەست بە ناوی (( کۆنگرەی ئەدەبی بەراوردکاری )). ئەوەی شایانی باسە مەڵبەندی نێوەندی (( کۆمەڵەی ئەدەبی بەراوردکاری )) زۆربەی وڵاتە عەرەبیەکان و برێك لە وڵاتانی ئەوروپا و وڵاتە سۆسیالیستەکانی ئەو سەردەمە بەشداری‌یان تێدا کردبوو.

لەو کۆنگرەیەدا بۆ مەسەلەی دوان لە ئەدەبی بەراوردکاری نیو سەعات بۆ من تەرخان کرابوو. خوێندنەوەی باسەکەم بە زمانی عەرەبی بوو و یەکسەر وەریان دەگێڕایە سەر زمانی فرەنسی و هەندێ زمانی دیکەی ئەو میوانانەی بەشداریان تێدا کردبوو.

ئەوی ڕاستی بێ بۆچوونی من بەرکوڵ یا بەرنامەیێك بوو لە بابەت ئەم زانستی‌یە تازەیە و چۆن لەلای ئێمەش پەیدابوو ، بە مەبەسی ئەوەی لەپاشانا ببێ بە کتێبێك من خۆم بینووسمەوە یا هەر کەسێکی دیکە لە قوتابیانی خوێندنی باڵا لە زانستگای عەننابە.

بۆ یەکەمین جار لەدوای زیاتر لە بیست ساڵ نویشکی باسەکە بە زمانی کوردی لەم کۆوارەدا بڵاودەکرێتەوە ، لەگەڵ دەسکاری‌یێکی کەم و تۆمارکردنی هەندێ زانیاری و تێبینی تازە کە دەکەوێتە دوای ساڵی ١٩٨٤.

## پێش داهاتنی (( بەراوردکاری ))وەك زاراوەییێکی زانستی

سێ ئینقلابە گەورەکەی ئەوروپا ، یەکەمیان لـە بـواری فیکـر و ئـەدەب و هونـەر (ڕینیسانسی ئیتالیا لە سەدەی پازدەم) ، دووەمیان شۆڕشی دیمۆکراتی (سەربەسـتی و دادگەری و یەکسانی لە فرەنسا ۱۷۸۹-۱۷۹۹) ، سـێیەمیان شۆڕشـی پیـشەسازی لـە بەریتانیا (سەرەتای سەدەی نۆزدەم) بوون بە مایە و سەرچاوە بۆ بیر کردنەوەی قـووڵ لە مێژووی ڕابردووی مرۆڤایەتی و بەکارهێنانی بۆ بەرژەوەند و چـاکەی ژیـانی کامـەرانی خەڵکی ئەم زەوییەی ئێمە. مێشکی مرۆڤ لە ڕاپەڕین دا بوو ، هەموو بـوار و مەیـدانێکی گرتبووەوە ئەوەی پێوەندی بە ژیانی ئادەمیزادەوە هەبوو.

لەم ماوەیەدا مەسەلەی گرنگ بـۆ ئێمـە گۆڕەپـانی ئەدەبـە. لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی هەژدەمــەوە شـوێنەواری هەنـدێ ڕێبــازی ئـەدەبی سـەریان هەڵـدا ، وەکـو ڕۆمانتیکی و ڕیالیستی و سیمبۆلی و ناتووری (سروشتی) و هی دیکە. هەروەها کۆمـەڵێك دەستووری تازە کەوتە ناوەوە لە بابەت بـیر و بـاوەڕ و هـزری پـێش سـەدەی هـەژدەم. لەپاشانا بوون بە هۆی ئەوەی ئەم بۆچـوونانە بـبن بـە بنـەما و بنکـەی هەنـدێ زانـستی تازە ، وەکو زانستییەکانی سایکۆلۆجی و کۆمەڵایەتی و بەراوردکاری و هی دیکە.

## زاراوەی (( ئەدەبی بەراوردکاری ))

بە کوردی (( ئەدەبی بەراوردکاری )) ، بە عەرەبی (( الأدب المقارن )) ، بە ئینگلیزی (( Comparative Literature ))ە. ئەگـەر سـەر پێیـی تەماشـای ئـەم زاراوەیـە بکـەین دەبیـنین زاراوە ئینگلیزییەکـە ئەسـڵە ، مانـا عەرەبییەکـەی لـە فەرهـەنگی ئینگلیــزی - عــەرەبی وەرگــیراوە ، لەپاشــانا زاراوە کوردییەکــە لــە فەرهــەنگی عـەرەبی - کـوردی وەرگـیراوە. بەڕاسـتی ئـەم سـێ ووشـەیە یـەك مانـا دەگەیـەنن لـە فەرهەنگی زمانی زۆربەی میللەتانی ئەوروپا و فەرهەنگەکانی زمـانی عـەربی و کـوردی ، وە هەر سێ لایەنیش ووشـەکانیان لـە فەرهـەنگی زمانـەوە وەرگرتـووە و کردوویانـە بـە زاراوە (مصطلح = termin) بۆ ئەو زانستییەی لە مەیدانی ڕۆشـنبیری و خوێنـدەواری کۆمەڵەکەیان پەیدابوو.

## شوێنەواری (( بەراوردکاری )) پێش ئەوەیببێ بە زانستی

لە سـەرەتای سـەدەی هـەژدەم ، لـە فرەنـسا هەنـدێ لـە مامۆسـتایانی زانـستگا ساکارانە هەستیان بەوە کردبوو پێوەندییێك یا لە یەکچوونێك لەنێوان ئەدەبی فرەنسی و نەتەوەکانی دیکەی ئەوروپادا هەیە. لەساڵی ١٨٢٨ ئێبیل فرانسوا ڤیلمان لـە زانـستگای پاریس لە موحازەرەیێکی ئەم مەسەلەی درکانـدبوو. لەسـاڵی ١٨٣٢ ژان ژاك ئـەمپیر لـە مەرسیلیا باسی ئەم پێوەندی‌یەی کردبوو. لەساڵی ١٨٣٥ ئەم جارەیان فیلاریت شال بە نووسین لە (( کۆواری پاریس )) لەم بابەتەوە چەند ووتارێکی بلاْوکردبووەوە.

لەسـاڵانی ١٨٣٧ــ١٨٣٩ هێنـری هـالام بیروڕاکـانی لـەم بابەتـەوە لـە کتێبـا بلاْوکردەوە. لەساڵی ١٨٩٦ ژۆزێف تکست لە شاری لیۆن ئەم بیرۆکە تازەیەی ووروژاند و بەردەوام لەسەری ڕۆیشت و لێی کۆڵیەوە.

لە نـەوەدەکانی سـەدەی نـۆزدەم لـە بـەریتانیا و فرەنـسا و ئـەڵمانیا تـا پلـەیێك هەموو بیروڕا و بۆچوونەکانی بە درێژایی سەدەی نۆزدەم کەوتبوونە نـاوەوە ، بـوون بـە هـۆی ئـەوەی نێوەنـدی زانـستگایی لـە وولاْتـانی ئـەوروپا ئـەدەبی بـەراوردکاری بـە زانستی‌یێك لە زانمستی‌یەکانی ئەدەب بژمێرن و وەك سیمینارێك خستیانە ناو بەرنامـەی خوێندنی زانستگاکانیان.

ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە ، بەرهەمی ئەدەبی (شیعر ، ووتار ، چیرۆك ، ڕۆمان ... هتد.) وەکو (( بوونەوەرێکی زیندووی نەمر )) لە هـەلێك دا لـە ویـژدانی شـاعیر و نووسـەر لەدایك دەبێ ، لەو دەمەوە دەبێ بە خاوەن مێژوو ، لەدوا ڕۆژدا کە هێشتا هەر زینـدووە و قەت نـاشمرێ سـێ جـۆرە زانـستی دەکەونـە نـاوەوە بـۆ پاراسـتنی ئـەم بەرهەمـە یـا بوونەوەرە هەمیشە زیندووە. ئەمانە ئەم زانستی‌یانەن:

**١ــ مێـژووی ئـەدەب:** بـاس لـە پەیـدابوون و لـەدایك بـوونی بەرهـەم دەکـا ، هەڵسوکەوتی لـە بابـەت نووسـینەوە و چـاپ کـردن و بلاْوکردنـەوە و ڕوون کردنـەوەی مەبەس و ماناکـانی دەردەبـڕێ ، نهێنـی و نادیارەکـانی ئاشـکرا دەکـا ، مێـژووی ژیـانی نووسەر و شاعیر بە بۆچوون و خەیاڵی شاعیری دەبەستێتەوە.

**٢ــ ڕەخنــەی ئــەدەبی:** لــە نرخــی ئیــستێتیکی بەرهــەمی ئــەدەبی دەدوێ ، لــە تــەرازووی دەدا ، جــوانی و ناشــیرینی پیــشان دەدا ، لایــەنی کــەموکووڕی دەخاتــە ڕوو بەپێی پێوانــەکانی دەســتووری زمــان و کــێش و قافیــە و ڕیــتم و ڕســتە و لێکسیکۆن و هەرچی پێوەندی بە زانستییەکانی زمانەوە هەیــە. ڕەوانبێــژی دەوری بــاڵای هەیــە لــەم ماوەیــەدا ، بــەڵام ئیدیۆلۆجیــەت و بــیری نەتــەوەیی و پڕۆپاگەنــدەی سیاســی و دیپلۆماســی دەوری لــە ڕەخنــەی هونــەری و ئــەدەبی دا نییــە. ئیــستێتیکا پێوانــە و تەرازووی ڕاستەقینەی ڕەخنەی ئەدەبییە.

**٣ـ ئەدەبی بەراوردکاری:** لە بنج و بناوانی پەیدابوونی بەرهەمی ئەدەبی دەدوێ ، لە بنیاد و نەژادی دەکۆڵێتەوە ، لە سەرچاوەی ئیلهامی نووســەر و شــاعیر دەگــەڕێ بــۆ ئــەوەی بگاتــە ئــەو ئەنجامــەی بەرهەمەکــە پێوەنــدییێکی بــە ئــەدەب و کولتــووری نەتەوەییێکی دیکەوە هەیە.

## زانستی ئەدەبی بەراوردکاری

بۆ تەعریفی ئەدەبی بەراوردکاری تێبینی و بۆچوون و تیۆریی زۆر لە ناوەوەیـە. لەگــەڵ ئــەوەی زانــستییێکی تازەیــە بــەڵام زۆری لەســەر نووســراوە ، لــە دواڕۆژیــش دا گومان لەوەدا نییە ماوە و گۆڕەپانی فراوانتر دەبێ. نەوەکانی داهاتوو لە ئێمە زیاتر لە مەسەلەکە دەگەن. پێویستە ئاگــاداری ئــەوەش بــین هەنــدێ پــسپۆڕی مەیــدانی ئــەدەب لەوە دوو دڵن بەراوردکاری ببێ بە زانستی ڕاست و نــاتوانن لەســەر ئــەوە ســوور بــن کــە دەمێنێ ، بەڵام لەوە دڵنیان ئەو هەوڵ و کۆشــشانەی لــەم دوو ســەد ســاڵەی دواییــەدا لــەم لایەنــەوە دراون مەیــدانی ڕەخنــەی ئــەدەبیان بــەهێز کــردووە لــەپێناوی ناســینی بەرهەمی ئەدەبی و پاراستنی لە جێگــەیێکی ئــەوتۆ شــایانی مــشتومال کردنــی مێــشك و خەیاڵ و چێژی ئادەمیزاد بێ.

ئــەم زانــستییە لــە پێوەنــدی نێــوان ئــەدەبی نەتــەوە جیاوازەکــانی گێتــی دەکۆڵێتەوە، باس لــەو ڕێبــازە هونەریانــە دەکا کــە لــە ئــەنجامی پەیــدابوونی بەرهەمــە بەرزەکانی گێتــی پەیــدا دەبــن. بــەراوردکاری لــە لەیــەك چــوونیان دەگــەڕێ ، ئــەو کاتــە

دەدۆزێتەوە کە لە یەکتری نزیك دەبنەوە. ئەو کەسەی ئەم کارە دەخاتە ئەستۆی خۆی پێویستە ئاگاداری چەند زمانێك و ئەدەبەکەیان بێ ، نەك تەنیا هی میللەتە هاوسێکان یا ڕۆژهەڵاتیەکان ، بەڵکو پێویستە زمانی میللەتانی ڕۆژئاواشی تێدابێ.

لەبەر ئەوەی بەراوردکاری زانستیێکی تازەیە و هێشتا بۆی ڕێك نەکەوتووە زۆرینەی سامانی ئەدەبی بەرزی مرۆڤایەتی یەکالا بکاتەوە (واتە جەردی بکا) ، بەتایبەتی بەرهەمی کلاسیکی گێتی ئەوەی هیچ نەبێ لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە ناوبانگی لە هەموو لایێك بڵاوبۆتەوە. هەروەها لە ناوەوەی خۆی بەرهەمێکی بەرز و مومتازە. لێرەدا مەبەسی ئێمە وەرگێڕانی ئەو بەرهەمە بەرزانەیە لە زمانی تایبەتی خۆیانەوە بۆ زمانانی دیکە. ئەمە سەرچاوە ئامادە دەکا بۆ ئەوانەی پسپۆڕی مەیدانی ئەدەبی بەراوردکارین. ئەم مەبەسە بە هیچ جۆرێ سەر ناگرێ ئەگەر ئەو بەرهەمانە بەو زمانانە لە ناوەوە نەبن کە پسپۆڕی بەراوردکاری دەیانزانێ. بەمەرجێ ئەو وەرگێڕانانە ڕاستەوخۆ لە تێکستی زمانە ئەسلیەکانیانەوە گەیەنرابنە ئەنجام بۆ ئەو زمانەی کە پێویستە.

## چۆن بەراوردکاری لە ئەوروپاوە گەیشتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست

هەموو شتێك و ڕووداوێکی داهێنراوی تازە لە فەلسەفە و فیکر و ئەدەب و هونەر، سەدەیێك یا هەندێ کەمتری گەرەکە لە ئەوروپاوە تا دەگاتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. شتی تازە لە پیشەسازی و تەکنیك لە ماوەیێکی کەمتر دەگاتە ئەوێ. گرنگترین ڕێگە بۆ ئەم مەبەسە لەنێوان هەردوو جەنگی گێتیی سەدەی بیستەم (١٩١٤ـ١٩٤٥) دەروازەکانی ئەستەموول و قاهیرە و بێرووت بوون هیچ نەبێ بە نیسبەت کوردستانی باشوور کە بەشێکی لە دواییدا بوو بە «کوردستانی عیراق».

لەپاش جەنگی یەکەم (١٩١٤ـ١٩١٨) هەندێ لە قوتابیانی خوێندنی بالا لە میسری و لبنانیەکان لە زانستگاکانی ئەوروپا بەتایبەتی زانستگای پاریس ئاشنایەتیان لەگەڵ زانستی ئەدەبی بەراوردکاری پەیدا کرد. هەندێکیان نامەی خوێندنی بالایان لەم بابەتەوە ئامادەکرد ، کە گەڕانەوە وولاتی خۆیان ، زۆربەی نامەکانیان بە زمانی عەرەبی خۆیان بلاوکردەوە. ئەو قوتابیانەی بوون بە پسپۆڕی بەراوردکاری ،

زانستی‌یەکەی خۆیانیان هێنایە ناو زانستگاکانی میسر و لبنان ، لەوێوە خزیە ناو زانستگاکانی وولاتانی دیکەی عەرەبی.

لەدوای جەنگی دووەم (١٩٣٩ـ١٩٤٥) و پەیدابوونی ئەم زانستی‌یە لە میسر و لبنان کارێکی ئاسایی بوو بگاتە زانستگای بەغدا. هەر لەو سەردەمەدا بوو هەندێ لە قوتابیانی عیراق لە شەستەکانی سەدەی بیستەم دا لە زانستگاکانی ئەورووپا ئاشنایەتیان لەگەڵ ئەم زانستی‌یە تازەیەدا پەیداکرد و ژمارەیێك نامەی خوێندنی بەرزیان لەم بابەتەوە گەیاندە ئەنجام بە مەبەسی وەرگرتنی پلەکانی ماجستێر و دوکتۆرا. ئیتر لەو ماوەیەدا بەراوردکاری کەوتە ناو بەرنامەکانی زانستگای بەغدا و لەپاشانا زانستگای دیکەی عیراق.

درەنگتر بەراوردکاری لەناو کۆمەڵی کوردەواری کوردستانی عیراق پەیدابوو ، بەتایبەتی کە زانستگای سلێمانی بەناوی زانستگای سەلاحەدینەوە گوێزرایەوەهەولێر (١٩٨٢).

لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمەوە زانستی بەراوردکاری لە زانستگاکانی کوردستان لە هەر سێ قۆناغی بەکالۆریۆس و ماجستێر و دوکتۆرا دەوترێتەوە.

## تاقی کردنەوەی بەراوردکاری لە ئەدەبی ڕووسی و عەرەبی‌دا

کولتووری کلاسیکی ڕووس لە سەدەی هەژدەم و نۆزدەم دا توانی داهێنراوی ئەدەبی بەرزی نەتەوەکانی ئەورووپا هەڵمژێ و بەرهەمێکی ڕەسەنی بێ وێنەی داهێنراوی بەرز بخولقێنێ. بەهۆی نزیکی لە گەلێ لە نەتەوەکانی ئاسیا و قەفقاس بە درێژایی دووسەد ساڵەی دوایی ـــ نەك تەنیا لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سۆڤیەتیەکان (١٩١٧ـ١٩٩١) ـ ماوەی بۆ فراوان بوو کار لە نەتەوەکانی دیکە بکا ، ئەوانیش تا ڕادەیێك کار لە ئەدەبی ڕووسی بکەن. لە ئەنجام دا بەرهەمی وەرگێڕدراو بوو بە سەرچاوەیێکی بنچینەیی و گرنگ لە مەیدانی پەروەردەکردنی خوێنەر و خوێندەواری ڕووسی لەپێناوی وەرگرتنی زانیاری‌ی گشتی و بەرزکردنەوەی پلەی خوێندەواری. هەر لەو کاتەدا بەرهەمی وەرگێڕدراو بوو بە سەرچاوەیێك بۆ ئەدەبی بەراوردکاری.

مەسـەلەکە لـە بابـەت ئـەدەبی عەرەبیـیـەوە کـارکردن و کـارلێکراو لـەنێوان ئـەو ئەدەبە و ئـەدەبی نەتـەوەکانی دیکـەدا لـە ڕۆژگـارانی کلاسـیکیدا بـەهێز بـوو. مەبـەس لێرەدا ئەوەیە کاریگەری ئەدەب و سامانی ڕۆشنبیری عەرەب لەسەر داهێنانی گێتـی لـە سەدەکانی ناوەڕاست و ڕاپەڕینی ئەوروپا ( ڕینیسانسی ئیتالیا ) ڕووداوێك بـوو گومـانی لێ ناکرێ. بەڵام ئامادەکردنی بەڵگە و سەرچاوە لەپێناوی لێکۆڵینەوە لـەم ماوەیـەدا لـە پلەی پێویست نەبوو.

ئێمە زۆرجار ئەو بیرۆکە ئاسایی و لاساییانە دووبارە دەکەینەوە و دەڵێین فلأنە بەرهەم جەوهەری عەرەبی یا ئیسلامی یا ڕۆژهەلأتی تێدایە بـەبێ ئـەوەی ئاگـاداری ئـەو بەرهەمە بین بە زمانی خۆمان ، دیارە زمـانی ئەسـڵی بەرهەمەکـەش نـازانین بـۆ ئـەوەی ڕاستەوخۆ بیخوێنینەوە. لێرەدا هەڵوێست نالەبار دەبێ! پێویستە پـێش هـەموو شـتێك بەرهەمی بەرزی داهێنراوی گێتـی وەربگێڕدرێتـە سـەر زمـانی عـەرەبی ، باسـی کـوردی ناکەم ، چونکە ئەگەر عەرەبییەکە لەم لایەنەوە دواکەوتبێ ، کوردییەکە زۆر کەمی بـۆ کراوە. ناچارین پرسیار بکەین: کوا وەرگێڕانـی زانـستی و ئـەکادیمی کۆمیـدیای دانتـی؟ کوا کارە ئەدەبیەکانی شەکسپیر؟ کوا بەهەشتی وون بووی میلتون؟ و گەلێکی دیکەش. ئەمانە سەرچاوەی بنچینەیین لە ئەدەبی بەراوردکاری گێتیدا.

ئەگەر کاریگەری کولتووری ئیسلامی بـەهێز بـووبێ لەسـەر ئـەدەبی نەتـەوەکانی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاسـت و ڕاپـەڕین ، پێـچەوانەکەشی ڕاسـتە. واتـە کاریگـەری ئەدەبی نەتەوەکانی ئـەوروپای نـوێ و سـەردەم لەسـەر داهێنـانی ئـەدەبی نەتـەوەکانی ڕۆژهـــەلأت کـــە عـــەرەبیش دەگرێتـــەوە بـــەهێزتر بـــووە ، لەگـــەڵ ئـــەوەش دا ئێمـــە ئاگاداریییەکی ئەوتۆمان لە بزووتنەوەی ئەدەبی نەتەوەکانی ئەوروپای سەردەم نییـە ، چونکە ئەو بەرهەمانە بەزۆری و بە ڕێکوپێکی یەکسەر وەرنەگێڕاونەتە سەر زمانـانی لای ئێمە.

## ئیلهام ، کارلێکردن ، وەرگرتن ، وەرگێڕان

لە ئەنجامی نەبوونی زانیاریی تەواو و وەرگێڕانـی ڕێکـوپێکی بەرهـەمی ئـەدەبی بەرزی نەتەوەکانی گێتی ڕەخنەگر و پسپۆڕی ئەدەبی بەراوردکاری دوو دڵ و بـێ بـاوەڕ

دەبــن بەرامبــەر نموونــەیێکی داهێنــراوی بــەرزی ئــەدەبی هــەر شــاعیرێکی ڕۆژهــەڵاتی سەردەم. ئەو ڕەخنەگرە سەری سوڕ دەمێنێ چونکە لەوە دڵنیایە بەرهەمەکە لـەڕووی داهێنــانی ئیــستێتیکییەوە بــەرزە. بــەڵام گومــانی لا پەیــدا دەبــێ لــەوەی داهێنــانێکی ڕەسەنە ، بیری بۆ ئەوە دەچێ لە شاعیرێکی ئەوروپی یا ئەفەریقی یا ئەمەریکای لاتینی وەرگیرابێ چونکە پێشتر ئاگاداری ئەوەیە ئەو شاعیرە یا نووسـەرە هەنـدێ زانیـاری لـە بابەت دەرەوەی وولاتی خۆی هەیە ، کەموزۆر شیعری شاعیرانی هەر پێـنج کـۆنتینێنتی لەبـەر دەسـت دایـە ، بەتایبـەتی گەنجـەکان بـە شـەوقەوە شـیعری شـاعیرانی ئـەمڕۆی نەتەوەکانی گێتی دەخوێننەوە.

ئەم دیاردە گوماناویە وای لێ دەکا نەتوانێ لە بەرهەمە داهێنراوەکە بکۆڵێتەوە بۆ ئـەوەی بگاتـە ئـەو ئەنجامـەی ، ئایـا بەرهەمەکـە وەرگـیراوە ! یـا زادەی کولتـوورێکی هوشیارانەیە بە درێژایی مێژوو لای شاعیرەکە یا نووسەرەکە دروست بووە ! ؟

## مەجالی ئەدەبی بەراوردکاری

زانستی ئەدەبی بەراوردکاری دیاردەیێکی تازەیە و تاقیکردنەوە و مەشقی کەمـە ، لەبەر ئەوە مەیدانی گەلێ گەورە و فراوانە لەڕووی پراکتیکـەوە. هـەر نەتـەوەیێکی کـە دەست نیشان دەکرێ بۆ ئـەم مەبەسـە پێویـستە شـێوەی پێوەنـدی ئـەو نەتەوەیـە بـە هاوسێکانی و نەتەوە دوور و نزیکەکانیەوە ڕوون بکرێتـەوە. لـەم لایەنـەوە دەکـرێ ئـەم بەڵگانە بخرێنە ڕوو:

١ـ ماوە زۆر فراوانە بەراورد لەنێوان ئەدەبی عەرەبی و ئەدەبی هاوسێکانی بکـرێ ، هەردوو لایان کاریگەرییان بەسەر یەکەوە بووە.

٢ـ بەراورد لەنێوان ئەدەبی میللەتانی ئەورووپای نوێ و کاریگـەرییان لـە ئـەدەبی عەرەبی.

٣ـ بەراورد لەنێوان ئەدەبی میللەتانی هەندێ لە یەکچوو و لە یەکنەچـوو ئەوانـەی لە هەڵسوکەوتێکی کۆمەڵایـەتی و سیاسـی وەك یـەك دەژیـن ، وەکـو کۆمـەڵی سـۆڤیەت ئەوەی زیاتر لە سەد نەتەوە و میللەتی تێدا دەژیا و هەموویان خاوەنی ئەدەب و هونـەر و نەریتی نەتەوەیی خۆیان بوون. دیارە لەو ماوەیەدا کاریگـەری ئـەدەبی قـەومی ڕووس

بەسەر ئەدەبی نەتەوەکانی دیکەدا بەهێز بوو ، بەتایبەتی کە دەسەڵاتی پارتی کۆمۆنیستەکان دەستووری بۆ ئەدەب و هونەر دەرکردبوو کە دەبێ « بە ڕوخسار نەتەوەیی و بە ناوەڕۆك سۆسیالستی » بێ. ئەم دروشمە بەپێی هەموو تیۆرییەکانی ڕەخنەی ئەدەبی هەڵە بوو. لەپاشانا خۆشیان وازیان لێ هێنا ، هەر لە سەرەتاوە دەبوو بڵێن « بە ڕوخسار نەتەوەیی و بە ناوەڕۆك کۆمەڵایەتی ».

٤ـ بەراورد لەنێوان ئەو نەتەوانەی بە ئایین و بیروباوەڕی ئایینزایی لە یەکتریەوە نزیك بوون ، هەروەها لە کۆمەڵێك دا هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی و سیاسی وەك یەکیان هەبێ ، ئەمە لە هەندێ کۆمەڵەکانی وولاتانی عەرەبی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکەوێتە بەرچاو. بەم ڕەنگە ماوەی زۆر لەبەردەم دایە بەراورد لەنێوان بەرهەمی ئەدەبی عەرەبی و ئەدەبی کوردی بکرێ لە عێراق و سووریا. گومان لەوەدا نییە کە هەردوو ئەدەب کاریان لە یەکتری کردووە ، با کاریگەری ئەدەبی عەرەبیش زیاتر بێ بەسەر ئەدەبی کوردییەوە ، چونکە ئەو هەلسوکەوتەی لەڕووی سیاسییەوە بۆ عەرەب هەڵکەوتووە بۆ کورد نەڕەخساوە. جگە لەوە تەنیا جەوهەری عەرەبی لە ئەدەبی کوردیدا نییە ، بەڵکو جەوهەری ئیسلامیش بەهێزە. گومان لەوەش دا نییە جەوهەری کوردەواری لە بەرهەمی گەلێ لە شاعیرانی عیراق و سووریا و لبنان و فەلەستین و میسر هەیە.

## بەراوردکاری لە ئەدەبی کوردیدا

ئێمە لەم ماوەیەدا ناتوانین باس لە ئەدەبی کوردی و زانستی بەراوردکاری بکەین ، چونکە لەڕووی پراکتیکەوە کارێکی ئەوتۆ بلاّونەکراوەتەوە ببێتە بەڵگە بۆ ئەوەی بەراوردکاری مێژوویێکی دیاری هەیە لە ئەدەبی کوردیدا. زۆربەی هەرە زۆری زانیاری لە بابەت ئەدەبی بەراوردکارییەوە ، لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەمەوە تا ئێستا ئەو موحازەرانە بووە کە لە بەشی زمانی کوردی زانستگاکانی عێراق و کوردستانی عیراق خوێندراونەتەوە ، ئەم موحازەرانەش لەدواییدا لە مێشکی مامۆستا و دەفتەری قوتابیان ماونەتەوە ، بێ ئەوەی خەڵکی دیکە سوودی لێ وەربگرن.

بۆ ئەم مەبەسە بە کورتی پرۆگرام و بەرنامەیێك دەخەینە بەرچاو ، وەك پلانێك بۆ مامۆستایانی زانستگا و قوتابیانی خوێندنی باڵا و هەموو تاکێکی بایەخ بەم زانستیە دەدا لەسەری بڕوا ، بۆ ئەوەی لە ماوەی دەورەیێك یا دوو دەورەی زانستگا (لە چوار ساڵ تا هەشت ساڵ) کارێکی زانستی (تیۆری و پراکتیکی) بەپێز و سەرکەوتوو بکرێ لەپێناوی ئەوەی زانستیانە پێوەندی ئەدەبی کوردی لەگەڵ نەتەوە هاوسێکان و ئەوانەی دیکەی گێتی دیاری بکرێ و نامەخانەی ئەدەبی کوردی پێ دەوڵەمەند بێ.

دەکرێ بەرنامەیێکی کورتی کاتی دابنرێ بەمەبەسی پێشخستنی ئەدەبی بەراوردکاری لە زانستگاکانی عیراق و کوردستانی عیراق ، ئەمە دەکەوێتە سەر شانی مامۆستایان و قوتابیان یا هەر کەسێکی دیکەی لە دەرەوەی زانستگا هەوەسی پشکنینەوەی هەبێ لەبارەی ئەدەبی بەراوردکارییەوە.

بەکورتی ئەم بابەتانە پێشنیاز دەکەین:

١ـ بەراورد لەنێوان ئەدەبی عەرەبی و کوردی ، بایەخ بە لایەنی کارتێکرنی عەرەبی بدرێ ، وەکو زمان و ئایین و ئایینزاو و بەشداری کردنی کورد لە دروست بوونی مەفهوومی یا تیۆریی (ئیسلامەوی) بەپێی لێکدانی کولتووری نەتەوەکانی عەرەب و فارس و تورکی عوسمانی و کورد و میللەت و نەتەوە گەورە و بچووکەکانی قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاست و هیندستانی گەورە. ئەم دیاردەیە لە عەرووز وقافیەی شیعر و ڕەوانبێژی و لێکسیکۆن ڕەنگی داوەتەوە و میللەتەکان بوون بە خاوەنی دیاردەکە و سامانی نەتەوەییان پاراست و پەرەیان پێ سەند.

بەسەرهاتی لەیلا و مەجنوون مەیدانێکی فراوان بوو بۆ نووسینەوەی ڕۆمانی شیعری لە ئەدەبی فارسی و تورکی و کوردیدا ، کەچی ئەدەبی عەرەبی خۆی کەڵکی لەم چیرۆکە شیعری میللییە وەرنەگرتووە ، چونکە چیرۆکی شیعری و داستان و مەلحەمە لە ئەدەبی ڕەسمی کلاسیکی عەرەبیدا باو نەبووە. هەروەها دەتوانرێ چیرۆکی بەسەرهاتی « یووسف و زولەیخا » لە سامانی عەرەب و هەندی لە نەتەوە سامییەکانە بکرێ بە سەرچاوە بۆ پەیدابوونی ڕۆمانی شیعری بەناوی ئەم چیرۆکەوە لە ئەدەبی کوردیدا. وەکو ئاشکرایە چیرۆکی یووسف و زولەیخا لە تەوڕات و قورئان دەور

کراوەتەوە. جگە لەمە زۆربەی چیرۆکەکانی ئەم دوو کتێبە پیرۆزە بوون بە سەرچاوەی ئیلهام لای شاعیری کورد بۆ نووسینی شیعری ئایینی (ئیلاهی‌یات و موناجات و نەعت و ستایشی رێبەر و ئەولیای ئایین و سۆفیزم).

٢ـ مێژووی ئەدەبی تورکی عوسمانی تازەیە و زۆر کۆن نی‌یە ، پێوەندی کورد بەم ئەدەبەوە لە سێ چوار سەدەی دوایی‌دا بووە ، لەدوا رۆژانی قۆناغی کلاسیکی‌دا لەژێر کاریگەری ئەدەبی عەرەبی و فارسی داهێنانی ئەدەبی لە زمانی تورکی‌دا کەوتۆتە ناوەوە. لەیلا و مەجنوون وەك بەرهەمێکی ئەدەبی میللی عەرەبی نەنووسراو بوو بەهۆی ئەوەی فوزوولی (١٥٦٠ کۆچی دوایی کردووە) بە زمانی تورکی چیرۆکی «لەیلا و مەجنوون» بهۆنێتەوە ، ئەم کارەی فوزوولی لەلایەك شاعیری کورد کانیی هەولێری (١٨٩٧ـ١٩٥٧) بە شیعر وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی ، لەلاییکی ترەوە خۆی لە خۆی‌دا بووە بە رەمزێك لەو سامانەی ئیسلامەوی پێ دەڵێین لەناو کۆمەڵانی عەرەب و فارس و تورك و کورددا.

ئەمەو لەدوا ساڵانی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم زمانی تورکی بە رێگەی دەروازەی ئەستەموولەوە رێبازەکانی ئەدەبی ئەوروپایی نوێی وەکو رۆمانتیکی و سیمبۆلی و هی دیکە لە پێشانا کاریان لە کۆمەڵی عوسمانی کرد ئەوجا گەیشتنە کوردستانی باشوور بەتایبەتی شاری سلێمانی. دیسانەوە رێبازە تازەکەی شیعری نوێ کە لەژێر کاریگەری ئەوروپا پەیدابوو و لای ئێمە «لاسایی عوسمانی» پێ دەووترێ ، ئەمەش سەرچاوەییێکی دیکە بوو بۆ پەیدابوونی «شیعری نوێ»ی کوردی.

٣ـ بەهۆی نزیکی کورد و فارس لەرووی نەژادەوە (هیندۆ ئەورووپی) ، هەروەها لەرووی زمانەوە (بنەماڵەی ئێرانی ، هیندۆ ئێرانی ، هیندۆ ئەورووپی) کورد کەوتۆتە ناو گێژاوی وون بوون. لەوەتەی دەوڵەتی فارسی شیعی بەناوی سەفەوی‌یەوە دامەزراوە (١٥٠١) کورد بووە بە تیرەییێك لە فارس. سیاسەتی دەوڵەتی موسوڵمانی شیعی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سەفەوی و قاجار و پەهلەوی و خومەینی‌یەوە تائێستا بەرامبەر بە کورد گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە ، چونکە زۆربەی کوردی ئەوێ بە عەقیدە

لەسەر بیروباوەڕی ئـایینزای سـوننین و بـە قەومیـەتیش کـوردن. ئیدیۆلۆجییـەتی پـان ئێرانیزم زمانەکەی کردووە بە یەکێك لە دیالێکتەکانی زمانی فارسی.

لەهەموو دەور و ڕۆژگارێك دا کامە زانای بابەتی و پیاو چاکە پێش هەموو کەسێك زمانی کوردی بە دیالێکتێکی زمانی فارسی دەزانیٚ و لـە ئـەدەب دا بـە خـاوەن ئـەدەبی میللیی نەنووسراوی فۆلکلۆری دادەنیٚ چونکە میللەتێکی دواکەوتووە !

زیاتر لە پێنسەد ساڵە کوردی ئێران تووشی هەناسەبڕکیٚ بووە ، تـا ڕۆژی ئـەمڕۆ لە قوتابخانەکان دا خوێندن بە زمانی کوردی لە هەموو ئێران دا قەدەغەیە.

سیاسەتی پان ئێرانیزم لە ئێرانا کوردی لـە هۆشـی خـۆی بـردووە ، تـەنیا لەبـەر ئەوە بەرەبەرەکانی ناکریٚ چـونکە بـە نەتـەوە کـوردە و فـارس نییـە ، بـەڵکو لـەڕووی عەقیدەوە زیاتر بەرەبەرەکانی دەکریٚ چونکە سوننییە.

پێنسەد ساڵە لە ئێرانا کـورد بەرەبـەرەکانی دەکـریٚ ، ئەمـە بۆتـە هـۆی ئـەوەی ڕێبازی پان ئێرانیـزم ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ بـەهێزتر بـیٚ. سیاسـەتی شـاردنەوەی حەقیقـەتی مەدەنییەتی کورد تەنیا فارسەکانی نەگرتۆتەوە ، بەڵکو خوێندەواری کوردیش تووشـی ئەم دەردە بـووە ، نـەك تـەنیا کـوردی ئێـران بـەڵکو کـوردی عیراقـیش. بـیٚ گومـان لـە قەڵەمی نووسەری کورد بە ئانقەست و بە هوشیاری بیری پان ئێرانیزم ناچۆڕێتەوە ، من ئەمە ناڵێم ، ڕاستییەکەی ئەوەیە مێشکی بـە پـەروەردەی کولتـوورێکی وا قـانگ دراوە بەبیٚ ئەوەی هەست بکا بووە بـە پـان ئێرانیـست ، ئەمـە نـەك تـەنیا مـەلا و دەرچـوانی حوجرەی مزگـەوتی گرتۆتـەوە بـەڵکو هەنـدیٚ لـە ڕۆشـنبیری تـازە بابـەت و دەرچـوانی ئەورووپایشی گرتۆتەوە.

بۆ بەڵگە لێرەدا تەنیا نموونەیێکی بچووك لەم بابەتـەوە دەخەمـە ڕوو: نووسـەر و شارەزاییێکی ئەدەبی کوردی کـە دیـوانی شـاعیرێکی کلاسـیکی کـورد سـاغ دەکاتـەوە و لیٚی دەکۆڵێتەوە ، کێش و قافیەی غەزەلەکان دیاری دەکا ناوی ئەو بەحرە عەرووزییە و قافیەیە دەبا کە شیعرەکە لەسەر کێشی هۆنراوەتـەوە. تـەنیا بـەوە ناوەسـتیٚ بـەڵکو دەڵیٚ فلانە شاعیری گەورەی کلاسیکی فارسیش لەسەر ئەم بەحرە عەرووزییە شـیعری داناوە و دێڕی یەکـەمی غـەزەل یـا قەسـیدە فارسـییەکە تۆمـار دەکـا. بـەم کردەوەیـە

شاعیره کوردەکە دەبێتە پاشکۆی شاعیره کۆنە فارسی‌یەکە. ئەم کارە لە زانستی ڕاستەقینەدا دوورە. بۆ نموونە ئەگەر شاعیرێکی کورد شیعرێکی لەسەر بەحری هەزەجی عەرووزی هۆنیبێتەوە چی پێویست دەکا بەرامبەر بەو شیعرێکی فارسی لەسەر ئەو کێشە پیشان بدرێ.

ئەوەی گومانی تێدا نی‌یە هەزاران هەزار شیعری عەرەبی و فارسی و تورکی و کوردی و شیعری گەلێ نەتەوەی دیکەی ئاسیای ناوەڕاست و ڕۆژهەلاتی نزیك و قەفقاس و هیندستان و پاکستان ، نەك تەنیا گێتی‌ی موسولمانان بەلکو خەلکی ئایینەکانی دیکەش لەسەر ئەم بەحرە عەرووزی‌یە دەکەوێتە بەرچاو. ئەوەی پێویستە لێرەدا بووترێ ئەوەیە زمانانی گریکی و لاتینی کۆنی لەناوچوو بەڕاستی دایکی زمانەکانی ئێستای ئەوروپان. کردەوەی ئیدیۆلۆجی‌یەتی پان ئێرانیزم ، لێرەدا ڕاستتر (فارسیزم) زمانی فارسی کردۆتە دایکی زمانی کوردی. ئەم زمانە دایکی هیچ زمانێك نی‌یە نەکوردی و نەزمانەکانی دیکەی نەتەوەکانی ئێران بەلکو یەکێکە لە زمانەکانی بنەماڵەی ئێرانی و هیندۆ ئێرانی و هیندو ئەورووپی.

بۆ پاراستنی حەقیقەتی زانست و کولتووری نەتەوەیی کورد پێویستە هەموو نووسەرانی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی کوردی ئەگەر خەریکی بەراوردکاری بوون لە مەسەلەیێك دا پێوەندی بە کولتووری کورد و فارسەوە هەبوو زۆر بە ووردی و هوشیاری بچێتە ناویەوە ، ئەگینا ئەنجام وای لێ دێ «فارسەکە دەبێتە ئەسلێ و کوردەکە دەبێتە فەرع». بەشی هەرە زۆری ئەو کارە ئەدەبیانەی بەرچاوی من کەوتوون بەم جۆرە بە ئەنجام گەیشتوون.

٤ـ ماوە هەیە بەراورد لەنێوان بەرهەمی کوردی لە شیعر و پەخشان و بەرهەمی ئەدەبی نەتەوەکانی ئەوروپا بکرێ ، بەتایبەتی ئەدەبی ئینگلیزی و فرەنسی و ڕووسی. دۆزینەوەی نموونەکان لەناو بەرهەمی شاعیر و نووسەرانی بزووتنەوەی ئەدەبی نوێی کوردی ناوچەی سلێمانی دەبێ. ئەو ئەدەبەی لەدوای جەنگی یەکەمی گێتی کەوتە ناوەوە و تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەمی خایاند.

# ئەنجام

ئەوەی سەرەوە هەندێ تێبینی و بۆچوون و مەفکوورەی جیاجیا بوو لـە زانـستی بەراوردکاری ئەوەی مەیدانێکی گەورە و فراوانی پڕ لە تەنگوچەڵەمە و گیروگرفتە. وەکو دیارە بە قەڵەمی درشت نووسراوە ، پێویستی بە وورد بوونەوە و مشتومالْ کردن هەیە.

لە کۆنگرەکەدا کە لە خوێندنەوەی باسـەکەم بوومـەوە بـە ئەزبـەر پـێش ئـەوەی شانۆی کۆبوونەوە بەجێ بێڵم ووتم: لەم ڕۆژانـەدا کۆمەڵـە چـیرۆکێکم دەست کـەوت بـە زمانی عەرەبی بەناوی « عود النعناع » لە نووسینی هونەروەر و نووسەری سووری فاتیح مودەریس بوو. ئەمە بە نەژاد کورد و بە عەرەبی دەنووسـی. چـیرۆکەکان ڕەنگدانـەوەی ژیانێکی هەژاری و گەدایی بوون ، هەندێ وێنەی هونەری جوانی لەناو کوردانی بـاکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریا هەڵبژاردبوو لەناو هەرێمی جزیرەی سووریا. بێ گومـان ئـەم کۆمەڵە چیرۆکە بووە بە سەرچاوەییێکی لەبار بۆ بـەراوردکردن بـە مەبەسـی دۆزینـەوەی جەوهەری کوردەواری لەناو ئەدەبی عەرەبی لە سووریا.

## ملخص البحث

# الادب المقارن وظهوره عندنا

د. معروف خزنەدار

كان واقع هذا البحث في شكل سيمينار أُجري في «المؤتمر العلمي العالمي للمقارنين العرب» الذي انعقد في شهر حزيران عام ١٩٨٤ في جامعة عنابة بالقطر الجزائري. وكان الحديث في ذلك المؤتمر باللغة العربية مع اقترانه بالترجمة الفورية الى اللغة الفرنسية. ولقد عرض الباحث موجزاً لتاريخ ظهور هذا العلم الحديث في أوروبا ثم انتشاره و وصوله الى شرقنا الاوسط ، ففي البداية الى مصر ولبنان ثم الى العراق في النصف الثاني من القرن العشرين. وفي الثمانينيات من ذلك القرن وصل الأدب المقارن كمادة حديثة الى أقسام اللغات الكردية والعربية والانكليزية في جامعة صلاح الدين بأربيل.

ولقد وضع الباحث بأيجاز بعض مفردات منهج دراسة موضوع الأدب المقارن للجامعات في كردستان العراق وجامعتي بغداد والموصل ، وبالاخص مايتعلق بعقد المقارنة بين نتاجات الأدب الكردي وآداب الشعوب المجاورة من العرب والفرس والترك وآداب الشعوب الاوروبية.

وفي حينه نُشر جانب من الآراء الواردة في ذلك السيمينار في الصحف الجزائرية باللغتين العربية والفرنسية.

و أخيراً يُهدي كاتب البحث عمله هذا الى الأساتذة والطلبة الذين لديهم رغبة أكيدة بالتخصص في ميدان الأدب المقارن في الجامعات العراقية كافة.

*Abstract*

# Comparative Literature and its emergence in Kurdistan

**Prof. Dr. Marouf Khaznadar**

This study was introduced as a seminar at International Scientific Conference for Arab comparative literature scholars in June 1984, Anaba University-Algeria.

The study initiated into a brief history of the emergence of this new science and its extension into Europe, then into Egypt and Lebanon, and into Kurdish, Arabic, English departments of Salladdin university in after years.

The researcher has drawn up a course of study for the universities of Kurdistan, Baghdad and Musol. It is a comparative study between Kurdish literature and those of neighbour nations.

At that time, some of the points were published in different Algerian newspapers in Arabic and French.

Finally, the writer of this study, dedicates it to the teachers and students of Iraqi universities, who are eager to specialize in this field of comparative literature.

# بواری زمانەوانی و ئاستەکانی شیکردنەوە

**پ. د. وریا عومەر ئەمین**

زانکۆی بەغداد

هەموو شتێ لەم سروشتەدا دەشێ بەلای کەمی لە چوار رووەوە سەیری بکرێ و لێی بکۆڵرێتەوە:

**یەکەم**: دەستنیشان کردنی شێوە و سروشتی پێکهاتنی کەرەسەیی و پەیوەندیی سیستەماتیکیی نێوان پێکهێنەرەکانی و چۆنیەتی کارکردنی. ئەم جۆرە شیکردنەوەیە بە شیتەڵی (وەسفی) ناو دەبرێ. گرنگترین لقە لە زانستدا و هەموو بوارەکانی تر بەجێبەجێ کردنی ئەم لایەنە دەهێنرێنە ئەنجام.

**دووەم**: بەراورد کردنی هەر شتێ بە شتێکی تر لە پێناو دەستنیشان کردنی لێکچوون و جیاوازیی نێوانیان. بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە هەنگاوی یەکەم دەبێ هەر یەکە لەو شتانەی بەراورد دەکرێن بە جیا لە رووی شیتەڵییەوە لێی بکۆڵرێتەوە و رووەکانی دەستنیشان بکرێن ئنجا خاڵە لێکچوو و جیاوازەکان بخرێنە روو. واتا ئەم جۆرە شیکردنەوەیە نایەتە ئەنجام بێ هەنگاوی یەکەم کە وەسفییە.

**سێیەم**: دەستنیشان کردنی ئەو پلە و قۆناغانەی شتێ لە پەیابوونییەوە پیایا تێدەپەڕێ بە خستنە رووی ئەو گۆڕینانەی بە سەریا هاتووە و هۆیەکانی. ئەم جۆرە شیکردنەوەیە بە مێژوویی ناو دەبرێ.

بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە دەبێ قۆناغە جیاوازەکانی هەمان شت هەر یەکە بەپێی پێڕەوی شیتەڵی لێی بکۆڵرێتەوە ئنجا بەراورد بکرێن. بە دەستنیشان کردنی جیاوازیی نێوان هەمان شت لە چەن قۆناغێکی جیا مێژووەکەی دەخرێتە روو.

**چوارەم**: پشکنین و لێکۆڵینەوە لەپێناو دۆزینەوەی ئەو بارودۆخ و هۆیانەی وایان کرد ئەو شتە پەیا بێ و بێتە بوون. ئەمە گەڕانە بە شوێن (نژاد)دا.

زمـان وەك هـەر (هـەبوو)ێـك و دیـاردە و سیـستەمێکی زینـدوو بـەر هـەمان پێـڕەو دەکەوێ. واتا دەشێ لە چـوار لایەنـەوە سـەیری بکـرێ و لێـی بکۆڵرێتـەوە. بـەم جـۆرە زانـستی زمـان وەك هـەر لقێکـی تـری زانـست چـوار لقـی سـەرەکیی لێ دەبێتـەوە. کـە ئەمانەن:

١- زانستی زمانی شیتەڵی (وەسفی) Descriptive Linguistics

٢- زانستی زمانی بەراوردی Comparative Linguistics

٣- زانستی زمانی مێژوویی Historical Linguistics

٤- نژادی زمان Origin of Language

هەریەکە لەم لقانە ئامانجی تایبەتیی خۆی هەیە و هەریەکە چەند رێبـازێکی هەیـە بـۆ شیکردنەوە.

## ١- زمانەوانیی شیتەڵی (وەسفی)

ئەم لقە بایەخ بـە شـیکردنەوەی زمـان دەدات لـەپێناو دەستنیـشان کردنـی شـێوە و سروشتی داڕشتن و پێکهاتنی کەرەسـەیی زمانەکـە و پەیوەنـدیی سیـستەماتیکی نێـوان بەشەکانی و چۆنیەتی کارکردنی.

لێکۆڵینــەوە لــە زمـان لەسـەر بناغـەی شـیتەڵی بایـەخ بـە زمـان دەدات لـەو سـاتە تایبەتییەی تیایا لەلایەن کۆمەڵە خەڵکێکەوە لە ناوچـەیێکی دیـاریکراودا بـەکاردەهێنرێ یا بەکارهێنراوە. بۆ نموونە زمانی کوردی ئێستا. یا زمانی کوردیی سەدەی نۆزدەم ..... هتد.

لەم جۆرە لێکۆڵینەوەیەدا نابێ بە هیچ جۆر باسـی هـیچ قۆنـاغێکی تـری زمانەکـە یـا شێوەکە بکرێ و نابێ هیچ لایەنێکی لەبەر رۆشنایی مێژووییدا لێـك بدرێتـەوە. لـەو کاتـە تایبەتییە دیاریکراوەدا چۆن بووە ئاوا دەخرێتە روو. وەك چۆن بە کامیرا وێنەی کەسێ

دەگیرێ و ئەو وێنەیە سیماکانی ئەو کەسەیە لەو کاتە تایبەتییەدا، زانستی زمانی شیتەڵیش ئاوایە، سیماکانی زمانەکەی ئەو کاتە تایبەتییە دەخاتە روو.

بۆ لێکۆڵینەوە لە هەر زمانێ لە رووی شیتەڵییەوە گەر کاتەکە ئێستا بێ ئەوە کەرەسەی شیکردنەوە راستەوخۆ لە زمانی رۆژانەی قسەکەرانەوە وەردەگیرێ. ئەگەر کاتەکە رابردوو بێ ئەوە دەبێ نووسراوی ئەو سەردەمە لەبەر دەستا بێ ئەگینا هیچ جۆرە لێکۆڵینەوەیێك نایەتە ئەنجام. بۆ نموونە گەر بمانەوێ لە سروشتی زمانی کوردیی سەدەی نۆزدەهەم بگەین ئەبێ پەنا بەرینە بەر پاشماوە نووسینەکانی ئەوسا کە دیوانە شیعرییەکانی لەو سەردەمەدا نووسراون.

## ئاستەکانی شیکردنەوەی شیتەڵی

یێکێ لە دەسکەوتە هەرە مەزن و گرنگەکانی مێژووی زمانەوانی دۆزینەوە و دەستنیشان کردنی ئاستەکانی شیکردنەوەیە Levels of analysis.

سادەترین کەرەسە لە هەموو زمانێکی مرۆڤیدا ئەو تاکە دەنگانەن کە بەهۆی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست دەکرێن. ئاڵۆزترین دانەی زمانیش رستەیە. پەیوەندیی نێوان ئەم سادەترین و ئاڵۆزترین پێکهاتانە لەسەر پێڕەوێکی تەپۆلکەیی Hierarchical دامەزراوە.

ئەو لقەی زانستی زمان کە لە دەنگەکانی زمان دەکۆڵێتەوە بە زانستی دەنگ Phonetics ناودەبرێ. ئەمە ئاستی یەکەم.

لە هەر زمانێکدا بەپێی دەستەیێك یاسا کە لە هەموو زمانانی جیهان هەمان شتە لەم دەنگانەوە سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانەکە واتا فۆنیمەکانی دەستنیشان دەکرێن. بەپێی دەستەیێك یاسای تر ئەم فۆنیمانە لێك دەدرێن برگە پێك دەهێنن.

ئەو بەشەی زانستی زمان کە هەوڵ دەدا فۆنیمەکانی زمان لە دەنگەکانییەوە دەستنیشان بکات و چۆن فۆنیمەکان لێك دەدرێن بۆ دارشتنی برگەکان بە فۆنۆلۆجی Phonology ناو دەبرێت. ئەمە ئاستی دووەم.

لەناو قاڵبی بڕگەکاندا فۆنیمەکان مۆڕفیمەکان پێك دەهێنن. لە مۆرفیمێ یا زیاتر وشە پێك دێت.

ئەو بەشەی زانستی زمان کە هەوڵ دەدات مۆڕفیمەکانی زمان دەستنیشان بکات و چۆن ئەم مۆڕفیمانە لێکدەدرێن بۆ داڕشتنی وشەکان بە مۆڕفۆلۆجی Morphology ناو دەبرێ. ئەمە ئاستی سێیەم.

بەپێی دەستەیێك یاسا ئەم وشانە لێکدەدرێن فرێز Phrase پێك دەهێنن. بەهۆی دەستەیێك یاسای تر ئەم فرێزانە لێکدەدرێن رستە پێك دەهێنن. ئەمە ئاستی چوارەم.

پەیوەندیی نێوان ئاستەکان لەسەر پێڕەوێکی تەپۆلکەیی ئەم جۆرەیە:

**رستە**

**فرێز فرێز فرێز**

**وشە وشە وشە وشە وشە وشە وشە وشە**

**مۆڕفیم مۆڕفیم مۆڕفیم مۆڕفیم مۆڕفیم مۆڕفیم مۆڕفیم مۆڕفیم**

**فۆنیم فۆنیم فۆنیم فۆنیم فۆنیم فۆنیم فۆنیم فۆنیم فۆنیم فۆنیم فۆنیم فۆنیم فۆنیم**

**فۆنیم فۆنیم**

**دەنگ دەنگ دەنگ دەنگ دەنگ دەنگ دەنگ دەنگ دەنگ دەنگ دەنگ**

**دەنگ**

ئەمە لە رووی قاڵب و داڕشتنەوە.

ئەرکی سەرەکیی زمان گواستنەوەی بیر و واتایە. (چەمك و واتا) لە پەیژەی تەپۆلکەیی ئاستەکانی شیکردنەوەدا لە مۆڕفیمەوە دەست پێ دەکات و بەرەو ژوور تا دەگاتە رستە.

ئەو لقەی زانستی زمان لە واتا دەکۆڵێتەوە بە واتاسازی Semantics ناو دەبرێ. ئەمە ئاستی پێنجەم.

ئەمە ئاست و لقە سەرەکییەکانی بواری لێکۆڵینەوەی شیتەڵییە. هەر یەکە لەمانە لقی تری لێ دەبێتەوە. ئەم لقانەش لقۆکەی تریان لێ دەبێتەوە و بەم جۆرە.

**أ - فۆنەتیك:**

قسە بە سێ قۆناغدا ئەرکی خۆی جێبەجێ دەکات. کە قسەکەر دەدوێ بای لە سییەکانەوە هاتوو بە قورگ و زار و لووتدا تێدەپەڕێ و لە ئەنجامی چەن جووڵانەوەیێکی ئاڵۆزی ئەندامانی ئاخاوتن زنجیرەی دەنگ دروست دەبێ. ئەم دەنگانە لە هەوادا بە هۆی شەپۆلەکان دەگوازرێنەوەو گوێگر بە گوێ دەیانبیستێ و هەواڵەی مێشکیان دەکات. مێشك ئەم دەنگانە شی دەکاتەوە واتاکانیان دەپارێزێ. واتا دەنگەکانی زمان دەشێ لە سێ رووەوە سەیریان بکرێ و لێیان بکۆڵرێتەوە.

١- لە رووی دروستکردنەوە Articulatory Phonetics

ئەمە میکانیزمییەتی ئەندامانی ئاخاوتن دەگرێتەوە. روونی دەکاتەوە چۆن دەنگەکانی زمان دروست دەکرێن. چین ئەو جووڵانەوانانەی بەشەکانی ئەندامانی ئاخاوتن کە دەبنە هۆی دروستکردنی هەر تاکە دەنگێك و لە چ بەشێکی زاردا دروست دەکرێن. سیماکانی هەر دەنگێ چین و بە چی لە دەنگەکانی تر جیا دەبێتەوە. لە فۆنەتیکدا یاسا نییە. تەنیا وەسفە.

٢- لەرووی فیزیاوییەوە Acoustic Phonetics دەنگەکان لە هەوادا کە بە هۆی ئەو شەپۆلانەی بە هێزی بای لە سییەکانەوە هاتوو و جووڵانەوەی ئەندامەکانی ئاخاوتن دروست دەبن.

٣- لەرووی وەرگرتنی Auditory Phonetics دەنگەکان بە گوێ و حەواڵە کردنیان بۆ مێشك و شیکردنەوە و پاراستنیان لە مێشکدا ئەمە میکانیزمییەتی گوێ و مێشك دەگرێتەوە.

**ب - فۆنۆلۆجی:**

ئەو لقەی زانستی زمانە کە لە یاسا دەنگییەکان دەکۆڵێتەوە. هەر زمانێك دەستەیێك یاسای تایبەتی بە خۆوەی هەیە ئەم ئەرکانە جێبەجێ دەکەن:

١- لە رێی جووتۆکە و سێتۆکەکانییەوە فۆنیمەکانی دەستنیشان دەکەن.

٢ــ لـەناو قـاڵبی بڕگـەی فۆنـەتیکی بـە دەسـتەیێك یاسـای تایبـەت بـە زمانەکـەوە فۆنیمەکانی لێك دەدات و بڕگەی فۆنۆلۆجی پێك دەهێنێ. ئەم لقە بـە Phonatactic structure.

٣ـ دەنگەکانی زمان، لە ئـەنجامی لێکدان و کەوتنـە پـاڵ یـەکیان، کـار لێـك دەکـەن. دەنگ هەیە سیمای دەگۆڕێ، هەیە دەتوێتەوە، هەیە لەگەڵ دەنگی تردا ئاوێتە دەبـێ و دەنگی سێیەم دێنێتە ئەنجام و هەشە دەنگی تر پەیا دەبێ.. هتـد. ئـەم کارلێککردنانـە هـەموو بـەهۆی دەسـتەیێك یاسـای تایبـەت بـە زمانەکـەوەن بـە یاسـا فۆنۆلۆجییـەکان Phonological Rules ناو دەبرێن.

٤ــ کەرەســەی دەنگیــی تــر هــەن لــە هــەر زمانێکــا بــە (ناکەرتییــەکان) Suprasegmental ناو دەبرێن. ئەمانە (هێز Stress) و (ئـاوازە Intonation) و (تۆن Ton) دەگرنەوە. هەر زمانەی یاسای تایبەتیی خۆی هەیە بۆ بەکارهێنانیان.

**ج - مۆرفۆلۆجی:**

شیکردنەوەی مۆرفۆلۆجیی هەر زمانێك ئەبێ ئەم ئەرکانە جێبەجێ بکات:

١ـ دەستنیشان کردنی مۆرفیمەکانی Morpheme زمانەکە. سـادەترین کەرەسـەی ئاستی مۆرفۆلۆجیایە.

٢ــ دەستنیـشان کردنـی ئـەو یاسـایانەی ئـەم مۆرفیمانـە لێـك دەدات بـۆ داڕشـتنی وشەکان.

٣ـ کە مۆرفیمەکان دەکەونە پاڵ یەك کار لێك دەکەن. شێوەیان دەگۆڕێ بـەپێی ئـەو ژینگە فۆنۆلۆجییانەی بە کەتنـە پـاڵ یـەك دروسـتی دەکـەن. واتـا دەستنیـشان کردنـی مۆرف Morph و ئەلەمۆرفەکانی Allomorph مۆرفیمەکان. ئەم بەشەی مۆرفیم بە مۆرفۆفۆنیم Morphophonemic ناو دەبرێ.

**د ـ سینتاکس:**

بەپێی دەستەیێك یاسای تایبەت بە زمانەکەوە وشەکان لێك دەدرێن بۆ داڕشتنی فرێزەکان و بە هۆی دەستەیێك یاسای تر فرێزەکان لێکدەدرێن بۆ داڕشتنی رستە. دەستنیشان کردنی ئەو یاسایانە بە رستەسازی Syntax ناودەبرێ.

**هـ ـ واتاسازی:**

سیمانتیك Semantics ئەو لقەی زانستی زمانە کە هەوڵ دەدا پەیوەندیی نێوان فۆرم و چەمك دەستنیشان بکات. سیما و کەرەسە سیمانتیکییەکانی مۆرفیمەکان و وشەکان دەخاتە روو و پەیوەندییە واتاییەکان لە ئاستی مۆرفۆلۆجی و سینتاکسیدا دەستنیشان دەکات. سنووری سیمانتیك لێکۆڵینەوەیە لەناو چوارچێوەی وشە و رستەدا بەدی دەکرێن هەڵدەهێنجرێن.

**و ـ پراگماتیك:**

زۆر واتای شاراوە هەیە تەنیا بە رەچاوکردنی بارودۆخی رستەکە لەناو دەقەکەیدا یا لەناو چوارچێوە و زەمینە و بارودۆخی کۆمەڵایەتیی و مێژوویی قسەکەرەکە دەرك دەکرێ.

ئەو لقەی زانستی زمان کە لە پەیوەندییەکانی واتایی نێوان زمان و دەرەوەی زمان دەکۆڵێتەوە بە پراگماتیك Pragmatics ناودەبرێ.

لقەکانی زمانەوانیی شیتەڵی لەم نەخشەیەدا خراوەتە ڕوو:

| | ئاست | ئامانج |
|---|---|---|
| بێ واتا | فۆنەتیک | دروستکردن |
| | | گواستنەوە |
| | | وەرگرتن |
| | فۆنۆلۆجی | فۆنیمەکان |
| | | بڕگە |
| | | کارلێککردن |
| | | ناکەرتییەکان |
| واتادار | مۆرفۆلۆجی | مۆرفیم |
| | | وشە |
| | | مۆرفۆفۆنیم |
| | سینتاکس | فریز |
| | | ڕستە |
| | واتاسازی | سیمانتیک |
| | | هێماسازی |
| | | پراگماتیک |

## ٢ ـ بواری بەراوردی Comparative Linguistics

### أ ـ بەراوردیی مێژوویی

سێر ولیەم جۆنس Sir Willam Jones (١٧٤٦-١٧٩٤) زمانەوانێکی بەریتانی بوو، لە هیندستان دەژیا. شارەزای زمانی لاتینی و گریکی بوو، کە زمانی سەنسەکریتی فێر بوو. بینی لێکچوونێکی یەکجار زۆر لەنێوان ئەم سێ زمانانە هەیە. لە ساڵی ١٧٨٦دا

وتارێکی لە کۆنگرەی کۆمەڵەی ئاسیەوی - بەنگالی پێشکەش کرد تیایا ئەم دیمانەی خستە روو:

"زمانی سەنسەکریتی هەر چەند کۆن بێ، دارشتنێکی قەشەنگی هەیە، لە گریکی تەواوترە و لە لاتینی دەوڵەمەندتر و بە پیتترە. لە هەردووکیان دڵگیرترە، لەگەڵ ئەمەدا لێکچوونێکی زۆر سەیر لەنێوان هەر سێ زمان هەیە، چ لە رووی رەگی کارەوە، چ لە رووی رێزمانەوە. ئەم لێکچوونە ئەوەندە زۆر و ئاشکرایە کە هەرگیز ناشێ بخرێتە پاڵ رێکەوت. هیچ زمانەوانێ نییە لە هەر سێ زمان بکۆڵێتەوە و نەگاتە ئەو بڕوایە کە هەر سێ زمان هاونژاد و هاوسەرچاوەن."

ئەمە ئاسۆیێکی نوێی کردەوە و بوو بە هۆی پەیا بوونی رێباز لە شیکردنەوەی زمانەوانیدا.

زمانەوان لە هەموو جیهانا کەوتنە بەراورد کردنی زمانەکانیان لەگەڵ زمانانی تری نزیك و دوور بەو ئاواتەی پەیوەندیی خزمایەتیی نێوانیان بدۆزنەوە. دوای زیاتر لە سەد و پەنجا ساڵ لێکۆڵینەوە لە سەرتاپای جیهاندا، سروشتی خزمایەتی و پەیوەندیی مێژوویی نێوان سەدان لە زمانە هاورەگەزەکانی ئەم بەر و ئەو بەری جیهان دەستنیشان کران. زمانەکانی جیهان لە چەن بنەماڵەیێك کۆکرانەوە و دووری و نزیکیی مێژوویی نێوان زمانە هاوبنەماڵەکان ئاشکرا بوو و رێگا دۆزرایەوە بۆ دەستنیشان کردنی نژادی تاکە زمانەکان.

تا سەرەتای سەدەی بیستەم بواری زمانەوانی بە تەواوی بە پێرەوی مێژوویی داگیر کرابوو. ئامانجی سەرەکیی زمانەوانان دۆزینەوەی جۆری پەیوەندیی خزمایەتیی نێوان زمانەکانی جیهان بوو. خۆیان بە بەراوردکردنی وشە سەرەکییە هاوواتاکانی زمانە جیاوازەکان خەریك کردبوو بۆ دەستنیشان کردنی ئەو گۆڕینانەی بەسەر دەنگ و وشەکانا هاتووە بە ئامانجی گەڕاندنەوەی وشە هاوواتا و هاورەگەکان بۆ هەمان سەرچاوە، کە لە رێیانەوە یاساکانی دەنگ گۆڕین لە زمانا دۆزرایەوە و بە هۆی ئەم یاسایانە رادەی پەیوەندی و سروشتی خزمایەتی نێوان زمانەکانی جیهان دەستنیشان کرا.

ئەم جۆرە شیکردنەوەیە، سەرەڕای گرنگی و سەرەڕای ئەوەی زۆر دیاردەی سەیر و لایەنی شاراوەی لە زمانا دۆزییەوە و ئاشکرا کرد، بەڵام زمانەوانیی لە ئەرکی سەرەکی و راستەقینەی خۆی لادابوو، کە هەوڵدانە بۆ تێگەیشتنی خودی زمان خۆی و چۆنیەتی کارکردنی وەك سیستەمێکی تەواوی دینامێکیی زیندوو.

لە ساڵی ١٩١٦دا کتێبەکەی فەردیناند دیساسۆر (١٨٥٧-١٩١٣) Cours de linguistique generale (کۆرسێ لە بارەی زمانەوانیی گشتی)ـەوە بڵاوبووەوە. ئەم کتێبە بریتییە لە تێبینییەکانی ئەو قوتابییانەی کە دیساسۆر لە ساڵانی (١٩٠٩-١٩١١) وانەی زمانەوانی و فەلسەفەی پێ وتبوونەوە. واتا دیساسۆر خۆی ئەم کتێبەی نەنووسیوە و دانەناوە، بەڵکو بیر و بۆچوونەکانی لە تێبینییەکانی قوتابییەکانییەوە هەڵێنجراون و لە کتێبێکا کۆکراونەتەوە و دوای مردنی بە سێ ساڵ بڵاوکراوەتەوە. زمانەوانی بەپێی چەمکی نوێی Linguistics لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبە دەست پێ دەکات.

سەرەڕای ئەم کەم و کوڕی و کەلێن و کەلەبەر و پچڕپچڕییەی لەنێوان بەش و بابەتەکانی ئەم کتێبەدا بەدی دەکرێ، دەرچوونی بە مەزنترین شۆڕش و گرنگترین رووداوی زمانەوانیی سەدەی بیستەم دەژمێررێ.

دیساسۆر هات و ئەم گۆمەی شڵەقاند، زمانەوانیی لە تەوقی مێژوویی رزگار کرد و دەرگای ئاسۆیێکی تری فراوانی ، لە جیهانی زمانەوانیدا، خستە سەر گازی پشت. چەن راییێکی سادەی دوو لایی (جووتەکی) dichotomy بەڵام یەکجار گرنگی پێشکەش کرد، بە هۆیانەوە رێچکەی شیکردنەوەی زمانی گۆڕی و زمانەوانیی هێنایە مەیدانی راستەقینەی خۆی.

دیساسۆر ئەوەی راگەیاند کە، لە شیکردنەوەی زمانا ئەبێ سەیری زمان بکرێ وەك سیستەمێکی تەواوی زیندووی سەربەخۆ. ئامانجی زانستی زمان و زمانەوان ئەبێ هەوڵدان بێ بۆ تێگەیشتن و دەرخستنی ئەم سیستەمە و چۆنیەتی کارکردنی. ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیەی لە پێڕەوی مێژوویی جیا کردەوە کە نزیکەی سەدە و نیوێك زاڵ بوو بوو

بەسەر زمانەوانییا. بەمە دیساسۆر دوو لقی سەرەکیی لە لێکۆڵینەوەی زمانەوانیدا جیاکردەوە.

١ـ لایەنی وەسفی Synchronic بایەخ بە شیکردنەوە و پێشاندانی شێوە و چۆنیەتی کارکردنی زمان ئەدات کە لەلایەن کۆمەڵە خەڵکێك لە کاتێکی دەست نیشانکراودا بەکاردەهێنرێ.

٢ـ لایەنی مێژوویی Diachronic لەو گۆڕینانە ئەکۆڵێتەوە کە بەسەر زمانا دێت بە تێپەڕینی کات.

زۆر گرنگە ئەوە بزانرێ کە (وەسفی) رێباز نییە. ئێستا بە دەیان رێباز لە بواری زمانەوانیدا هەیە کە هەموو وەسفین چونکە وەسفی زمان دەکەن وەك سیستەم. (وەسفی) Synchronic زاراوەییێکی دیساسۆرییە بۆ جیاکردنەوەی لێکۆڵینەوەی مێژوویی Historical لە شیکردنەوەی سیستەماتیکی زمان.

زمان وەك دیاردەییێکی ئاڵۆز و سرك بۆ شیکردنەوە و لێکدانەوەی لایەنەکانی گەلێ بۆچوون و پێڕەوی جیا هەڵدەگرێ. هەر بۆچوونێك رێبازێکە، پێڕەو و تەکنیکی تایبەتی خۆی لە شیکردنەوەی زمانیدا هەیە. (دوایێ دێینەوە سەر ئەمە).

### ب ـ بەراوردیی تایپۆلۆجی Typological Liguistics

هەزاران زمان لەسەر رووی ئەم زەمینە هەیە. هەندێ لەم زمانانە لێك دەکەن و هەندێ جیاوازن. هەر لە کۆنەوە زمانەوانان بیریان لە لێکچوون و جیاوازیی نێوان زمانان کردووە.

زمانەوانی ئەڵمانی ویلهێلم ڤۆن هەمبۆڵدت (١٧٢٦–١٨٣٥) زمانانی جیهانی دابەش کردە سەر سێ تایپ (جۆر) بەپێی سروشتی داڕشتنی وشەکانیان.

١ـ ئەو زمانانەی وشەکانیان لە زیاتر لە مۆرفیمێك پێك دێن. مۆرفیمەکانی بەڕیز پێکەوە دەلکێن و قالبی هەریەکەیان بە ئاسانی دەستنیشان دەکرێن و لێك جیا دەکرێنەوە ناوی نان agglutinative (نووساو). وەك یابانی و تورکی و سواهیلی.

٢ـ ئەو زمانانەی وشەکانیان لە زیاتر لە مۆرفیمێك پێك دێن و مۆرفیمەکانی لەناو یەکتردا تواونەتەوە و قاڵبەکانیان دەستنیشان ناکرێن و لێك جیا ناکرێنەوە ناوی نان Fusional یا Inflecting (تواوە) لاتینی و یۆنانی.

٣ـ ئەو زمانانەی وشەکانیان لە تاکە مۆرفیمێك پێك دێت و هەرگیز رێگە نادەن هیچ مۆرفیمێکی تریان پێوە بلکێ ناوی نان Isolating یا analytic (دوورەپەرێز). وەك چینی و بورمی.

ئەمە یەکەم هەوڵدان بوو بۆ پۆلکردنی زمانانی جیهان بەپێی لێکچوونیان لە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا. بەمە رێبازی تایپۆلۆجی سەری هەڵدا. ئەم رێبازە بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدرا تا سەرەتای شەستەکان. لە ساڵی ١٩٦٣دا گرینبێرگ J.H. Greenberg باسێکی بەناو Some uviversals of grammar with particular reference to the order of meaningful elements بلاوکردەوە تیایا ئاماژەیێکی زۆر زمانانی سەر بە بنەماڵەی جیاجیای ئەمبەر و ئەوبەری جیهانی بەراورد کرد لە ئاستی مۆرفۆلۆجی و سینتاکسیدا. لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دەرکەوت کە سروشتی ریزبوونی بەشە بنجییەکانی رستە (بکەر ـ بەرکار ـ کار) پەیوەندییان بە جۆری وشەکانی زمانەکەوە هەیە (نووساو ـ تواوە ـ دوورەپەرێز) هەروەها بە وەی ئایا زمانەکە پێشبەندییە Prepositinal یا پاشبەندی Postpositional. ئەمانە و چەن ئەنجامێکی تریش. بەمە رێبازی (تایپۆلۆجی) Typology بە گیانێکی نوێ سەری هەڵدایەوە.

ئامانجی ئەم رێبازە دەستنیشان کردنی قاڵبە گشتییەکانی Universal نێوان هەموو زمانانە لە رێی بەراورد کردنیان لە پێناو لێکدانەوەیێکی گشتیی داڕشتنی زمانی مرۆڤی.

ئەم رێبازە لەبواری فێرکردنی زمانیشا Pedagogical قۆزراوەتەوە بۆ مەشق کردن و دەست نیشانکردنی گیروگرفتەکانی فێربوونی زمانی تر. بۆ جیاکردنەوەی لە ئامانجی تیۆریی، بۆ ئەم پێڕەوە زاراوەی Contrastive دانرا.

بەم جۆرە زمانەوانیی بەراوردی سێ لقی لێ دەبێتەوە:

١- بەراوردیی مێژوویی Historical

٢- بەراوردیی تایپۆلۆجی Typological

٣- بەراوردیی مەشقی Contrastive یا Applied Linguistics

## ٣- زمانەوانیی مێژوویی Historical Linguistics

گۆڕین یاسایێکی ئەزەلیی ئەم سروشتەیە. باری ئێستای هەر شتێ جیایە لە هی هەر کات و سەردەمێکی تری. هیچ هێز نییە گۆڕین بوەستێنێ. گۆڕین دوو هۆی هەیە، (دەرەکی) External و (ناوەکی) Internal.

هۆی (ناوەکی ئەوەیە کە هێزێکی شاراوە هەیە کار لە شت دەکا و دەیگۆڕێ زانست دەرکی پێ ناکات، ئەم هێزە هەرگیز دەستی بەسەرا ناهێنرێ). گۆڕین پەیوەندیی بە دینامیکییەتی ناوەوەی گەوهەری کەرەسە و سروشت خۆیەوە هەیە. ئەم سروشتە هەمووی و هەرچییەکی تیایە لە جووڵە و گۆڕینێکی بەردەوامە. هیچ هێز نییە بتوانێ رایگرێ.

هۆی (دەرەکی) کە ژینگە دەگرێتەوە، رۆڵی بالاّ دەگێڕێ لە ئاراستە کردنی سروشتی گۆڕینەکە. گەر سیستەمێ خرایە دوو ژینگەی جیا پاش ماوەیێ دەگۆڕێ لە هەر ژینگەیێکا بە جۆرێ و دەبێ بە دوو سیستەمی جیاواز. هەر یەکە بە گوێرەی بارودۆخی ژینگە تایبەتییەتەکەی خۆی.

زمان لە گۆڕینێکی بەردەوامدایە. باری جوغرافی و ئابووری و کۆمەلاّیەتی و پەیوەندی لەگەڵ زمانانی تر دەور دەگێڕن لە چۆنیەتی شێوە گرتنی ئەم گۆڕینانە کە هەموو ئاستەکان دەگرێتەوە (واتا دەنگەکان - یاسا فۆنۆلۆجی و مۆرفۆلۆجی و سینتاکسییەکان و سیمانتیك و پراکماتیك).

گۆڕینی زمان زۆر لەسەرەخۆ دەبێ هەرگیز قسەکارانی زمان هەستی پێ ناکەن. لەو زمانانەی قۆناغە پێشووەکانی لە نووسینا پارێزراون ئەم گۆڕینە بەدی دەکرێت. گەر چاوێ بخشێنرێ بەو گۆڤار و رۆژنامە کوردییانەی پەنجا شەست ساڵێکی بەر لە ئێستا زۆر بە روونی دەردەکەوێ کە زمانی کوردی لەم ماوەیەدا زۆر گۆڕاوە.

بۆ دەستنیشان کردنی ئەم گۆڕینانە دەبێ زمانەکە لە قۆناغە جیاوازەکانا، لـە هـەموو ئاستەکاندا شی بکرێتەوە و بەراورد بکرێ و جیاوازییەکان دەستنیشان بکرێن.

ئەو لقەی زمانەوانی کە لە مێژووی وشەکانی زمان دەکۆڵێتەوە و هەول ´دەدا بیانگەڕێنێتەوە سەر رەچەڵەکەکانیان بە ئەتیمۆلۆجیا Etemology ناو دەبرێ.

**د ـ زمانەوانیی شێوەزاری**

گەر کۆمەڵە خـەڵکێکی هاوزمـان هـەموو لـە ناوچـەیێکا بـە یەکـەوە ژیـان و مانـەوە و پەیوەندیی جـوغرافی و کۆمەلأیـەتیی نێوانیـان نەپـچڕا، زمانەکـەیان دەگـۆڕێ ئـەوە لـە هەموو بەشەکانیدا هەمان شێوە دەگرێتە خۆ. ئەگەر هات و ئەم کۆمەڵە خەڵکە پەرش و بلأوبوون و لێك دابڕان چ لە ئەنجامی پەیابوونی سنووری سروشتی یا سیاسی لەنێوانیان یا لە ئەنجامی کۆچکردن، ئەوە هەر بەشەی دەکەوێتە ژینگە و بارودۆخێکی جیا لـەوانی تر، بۆیە گۆڕینەکەیان یەکسان نـابێ و لـە هـەر ناوچـەییێکا شـێوەیێکی جیـا لـەوانی تـر دەگرێتە خۆ. پاش ماوەیێك دەبن بە چـەن شـێوەیێکی جیـا. چـەن کـاتی بەسـەرا بـچێ شێوەکان دوورتر دەکەون و زیاتر لێك دەترازێن و جیاوازیی نێوانیان زیاتر دەبێ.

ئەو بەشەی زمانەوانی کە لەم لایەنەی دەکۆڵێتەوە بە شێوەزارناسـی Diactology ناودەبرێ.

لەناو چوارچێوەی شێوەیێك یا زمانێکدا و لە ئەنجامی هەبوونی سنووری کۆمەلأیـەتی و پیشەیی و ئابووری لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵەکە، هەر کۆمەڵەی فەرهەنگ و دەربڕینـی تایبەت بە خۆوەی دەبێ. بەمە شێوەزاری کۆمەلأیەتی سەرهەڵدەدات.

بەم جۆرە شێوەزارناسی دوو لقی لێ دەبێتەوە:

١ـ جوغرافی

٢ـ کۆمەلأیەتی

## ٤ـ نژادی زمان وەك دیاردەییێکی مرۆڤی گشتی

بۆ هەزاران ساڵ زمانەوان و فەیلەسووفان هەوڵیان داوە بزانن چۆن و کەی و لـە کـوێ زمانی مرۆڤ داهات. لەم بارەیەوە گەلێ لێکۆڵینـەوە و چـەن تیۆرییـەك پێـشکەش کـراون بەلأم هیچ یێکێکیان ناتوانن وەلأمێکی تینووشکێن پێشکەش بکەن لەم بارەیەوە.

سـەرهەڵدانی زمـان وەك هـەر دیاردەیێـك كـە پەیوەنـدیی  بـە سـەرەتای پـەیابوونی بوونەوە هەیە ئاڵۆز و لێڵە. ئێستا زمانەوانی وازی لەو جۆرە باس و لێكۆڵینەوانە هێناوە و زیاتر لە بواری پەرەسەندنی مرۆڤ سەیری دەكرێت.

(نژاد) و (مێژوو) دوو شتی جیان. نژاد لـەو بارودۆخانـە دەكۆڵێتـەوە كـە بوونـە هـۆی پەیابوونی شتێ. مێژوو ئەو قۆناغانەیە كە بەسەر شتەكە تێدەپەڕێ لە پەیابوونییـەوە و بەرەوژوور.

بـوار و لقـە سـەرەكییەكان و ئاسـتەكانی شـیكردنەوەی زمانـەوانی لـەم خـشتەیەدا كۆكراوەتەوە.

## سەرچاوەكان

1- Aitchison, J. (2005) Linguistics. London.
2- Crystal, D. (1989) The Cambridge Encyclopedia of language. Cambrighe University Press.
3- Fromkin, V. et al. (2003) An Introduction to Language. $7^{th}$ ed. Thomson-Heilin.
4- Hockett. Ch. F. (1969) A course in Modern Linguistics. Toronto.
5- Robins, R. H. (1997) A short History of Linguistics. Longman.

## ملخص البحث

# فروع علم اللغة ومستويات التحليل العلمي

د. وريا عمر أمين
جامعة بغداد

اللغة نظام معقد للغاية. علم اللغة يعمل من أجل دراسة اللغة على أسس علمية. يحتل علم اللغة مجالات متعددة ويشمل مواضيع مختلفة ومتشابكة.

يميز علم اللغة نوعين من الدراسات اللغوية. ( التاريخية ) و ( الوصفية ). في المجال الوصفي يحدد علم اللغة مستويات التحليل العلمي . يشمل مستويات التحليل العلمي ستة مجالات أساسية وهي: ( ١ – علم الصوت. ٢ – علم نظم الصوت. ٣ – علم الصرف. ٤ – علم النحو. ٥ – علم الدلالة. ٦ – الذراعية أو البراغماتية. ).

يمكن مقارنة اللغات المختلفة من أجل تحديد أوجه التشابه والاختلاف فيما بينها، فى المستويات المختلفة، بهدف تصنيفها إلى مجاميع تشترك في أنماطها بهدف الوصول إلى صياغة نظرية شاملة للتركيب اللغوي. يسمى هذا الفرع من علم اللغة بـ ( علم اللغة النمطي ). كما يمكن مقارنة اللغات لكشف أواصر القرابة والعلاقات التاريخية بينها وتحديد العلاقات الجينية بينها من اجل تصنيفها إلى فصائل وعوائل لغوية. يسمى هذا الفرع من علم اللغة بـ ( علم اللغة التأريخي).

تشابك علم اللغة بالعلوم الأخرى أدت إلى ظهور العديد من الفروع الأخرى لعلم اللغة. فيما يلي ندرج بعض من أهم تلك الفروع:

١ – علم اللغة الانثروبولوجى
٢ – علم اللغة الحيوي
٣ – علم اللغة ألسريري والطبي
٥ – علم اللغة العرقي
٦ – علم اللغة المؤسساتي

٧ – علم اللغة الرياضي

٨ – عام اللغة العصبي

٩ – علم اللغة الآثاري

١٠ – علم اللغة الفلسفي

١١ – علم اللغة النفسي

١٢ – علم اللغة الاجتماعي

١٣ – علم اللغة الفضائي

١٤ – علم اللغة ألإحصائي

١٥ – علم اللغة التطبيقي

١٦ – علم اللغة القضائي

.....الخ.

ولكل فرع من هذه الفروع العديد من النظريات والأساليب المختلفة للبحث والتحليل.

*Abstract*

## Linguistics branches and the Levels of analysis

**Professor Dr. Waria Omar Amin**

Language is immensely complicated system Linguistics is the scientific study of language. It covers a wide range of topics.

A major distinction is made between historical and descriptive linguistics. The former refers to the study of language change(**Diachronic**) , the latter refers to the study of the state of language at any given point in time(**Synchronic**).

Synchronically several levels of analysis are identified. The levels of analysis are (**Phonetics, Phonology, Morphology, Syntax, Semantics and Pragmatics**).

Comparing languages systematically in terms of their structural features they share at any level of analysis to classify languages to groups by identifying the common characteristics of different languages . Comparison of languages on this basis is called (**Typological Linguistics**).

The overlapping of linguistics and other disciplines has let to the emergence of new branches of linguistics. The following are the most known:

**Anthropological Linguistics**
**Biolinguistics**
**Clinical Linguistics**
**Computational Linguistics**

**Critical linguistics**
**Educational Linguistics**
**Ethnolinguistics**
**Institutional Linguistics**
**Mathematical Linguistics**
**Neurolinguistics**
**Palaeontolinguistics**
**Philosophical Linguistics**
**Psycholinguistics**
**Sociolinguistics**
**Space Linguistics**
**Statistical Linguistics**
**Applied Linguistics**
**Judicial Linguistics**
**……..etc.**

Each of these branches has its own theories and means of analysis.

# فەرهەنگێکی دێرینەی کوردی
# (١٢٢) ساڵ لەمەوبەر نووسراوە

**پێشەکی**

**محەممەد حەمەباقی**

**-١-**

**ئەم فەرهەنگە**

ساڵی (١٩٨٩ز) ئەم فەرهەنگەم لە کتێبخانەی میللی تاران دەستخست و هەر ئەو کاتەش ژمارەی سپاردنەکەیم بە کتێبخانەی ناوبراو، لەسەر پارچە کاغەزێکی جیاواز لای خۆم یادداشت کرد، بەهیوای ئەوەی هەر کاتێ نۆرەی کار لەسەرکردنی گەیشت، بەسەریان بکەمەوە. کەچی لە نزیکەی ئەم (١٧) ساڵە و ئەو هەموو ماڵە گوێزە و جێگە گۆڕکێیەدا، دەرکەوت ژمارەی سپاردنەکەیم بە کتێبخانەی میللی تاران، وەك دەیان و سەدان کوتە کاغەز و ناونیشانی تر، تێکەڵ و پێکەڵ و بزربووە، بەڵام خۆشبەختانە خودی فەرهەنگەکە، وەك خۆی بە پارێزراویی ماوەتەوە و ئێستا، کە نۆرەی کار لەسەرکردنی هاتبوو، بە چاکم زانی بە سەری بکەمەوە.

**پێناسەی فەرهەنگەکە:**

١ـ ئەم فەرهەنگە ساڵی (١٣٠٣کۆچی ـ١٨٨٥ـ١٨٨٦ز)، واتە (١٢٢)ساڵ لەمەوبەر، لەلایەن (ئەبولموحسین)ی پێشخزمەتی ئەردەڵانی کوردستان (سنە)وە نووسراوە.

٢ـ فەرهەنگەکە (٤٣) لاپەڕەی قەوارە مام ناوەندی و ئەندازەی لاپەڕەکانی (٢١سم × ١٥سم)ە و لە هەر لاپەڕەیەکدا ژمارەی (١٥) دێڕی تێدا نووسراوە.

٣ــ فەرهەنگەکە کوردی (شێوە زاری ئەردەڵان) ــ فارسییە و لە بەرامبەر هەر واژەیەکی کوردیدا، ماناکەی بە فارسی نووسراوە.

٤ـ فەرهەنگەکە تا لاپەڕە (١٠)ی، بە گوێرەی تیپەکانی (ئەبجەد) ڕێکخراوە.

٥ــ بۆ زیاتر ڕێنوێنی چاوی خوێنەر و جیاکردنەوەی واژەگەلی کوردی، لەگەڵ واژەگەلی فارسی، بە دوو جۆر ڕێسای خەت نووسیوە:

ـ واژەگەلی کوردی، بە شێوە خەتی (نەسخ) نووسیون.

ـ واژەگەلی فارسی، بە شێوە خەتی (فارسی) نووسیون، کە هەر لێرەشەوە دەیەوێ بیسەلمێنێ، کە ئەم دوو زمانە: فارسی و کوردی، لە یەکتر جیاوازن و هەر یەکەیان بە جیا، زمانی جیاواز و سەربەخۆیە.

٦ــ سەرجەمی ئاماری واژەگەلی ئەم فەرهەنگە، بریتییە لە (٥٣١) واژە، لەم ژمارەیەشدا لەگەڵ (٣١) واژەیاندا، کارێکی تایبەت و جیاوازی ئەنجامداوە، بەوەی لەگەڵ چۆنێتی و شێوەی داڕشتن و ئاڵوگۆڕی (کار)ی ئەم واژانەدا، کاری (ڕێزمان)ی کردووە.

٧ـ مخابن لاپەڕە (١ و ٢)ی ئەم فەرهەنگە واتە: دوو لاپەڕە لە تیپی (ئـ) فەوتاوە و لە لاپەڕە (٣)وە دەست پێدەکات.

٨ـ ئەم فەرهەنگە هێشتا دەستنووسە.

٩ـ وەك نووسەر دەڵێ فەرهەنگەکە لەسەر ڕاسپاردە و فەرمانی ناسرەدین شای قاجار (١٨٤٨ـ١٨٩٦) نووسراوە.

## ـ٢ـ
## تایبەتمەندییەکانی ئەم فەرهەنگە

ئەگەرچی نەتەوەکانی دراوسێی کورد، وەك عەرەب و فارس: سەدان و بگرە هەزار ساڵێکیش بەر لە ئێستا، دەستیان بە فەرهەنگ نووسینی زمانەکانیان کردووە[*]، بەلاَم

[*] لە نموونەی فەرهەنگی دێرینەی عەرەبی، ئەمانەن: لسان العرب، تاج العروس، محیط المحیط... هتد.

سـەرەڕای ئـەو سـەدان سـاڵ دواکەوتنـەی کـورد لـەم بـوارەدا رەنگـە ئەمـە یەکـەمین فەرهەنگی کوردی ـ فارسی بێت، کە تائێستا کـوردێکی رۆژهـەلاّت (ئـەردەلاّن)، بـەر لـە (۱۲۲) ساڵ بەم شێوە رێکوپێکە نووسیبێتی.

نووسەر هەر لە بنەڕەتدا فەرهەنگەکەی نـاو نـاوە: (هـذا کتـاب لغـات کـردی، واتـە: ئەمـە کتێبـی واژەگـەلی کوردییـە). دواتـر نووسـەر لـە پێناسـە کردنـی فەرهەنگەکەیـدا پێشەکییەکی کورتی (١٤) دێڕیی بە زمانی فارسی بۆ نووسیوە و لـە یەکـەمین دێـڕەوە، زمـانی کـوردی، وەك زمـانێکی جیـاواز و سـەربەخۆ و تایبـەت بـە گـەلی کـورد پێناسـە کـردووە. ئەمـە لـە کاتێکـدا نووسـەری ئـەم فەرهەنگـە، بـەر لـە (۱۲۲) سـاڵ بـەمجۆرە سەربەخۆیی و تایبەتمەندیی و رێزەوە بۆ زمانی کـوردی دەنـواڕێ، کـە هێـشتا زۆرینـەی ئەوانـەی لەسـەر زمانـەکانی ئێرانـی دەدوێـن و دەنووسـن، بەتایبـەتیش هەنـدێ گـەورە نووسەری فـارس و تەنانـەت دەسـگایەکی گـەورەی وەك (فەرهەنگسـتان)[(*)]ی ئێـرانیش پێیان وایە زمانی کوردی، شێوەزارێکی زمانی فارسییە!.

کەچـی نووسـەری ئـەم فەرهەنگـە، بـەر لـە (۱۲۲) سـاڵ، لـە بەشـێکی پێـشەکی فەرهەنگەکەیدا دەنووسێ: **"بر رأی خداوندان عقـل و زکـا، اینمعنـی ظـاهر و هویداسـت زبانی کُردی، که از ألسنه فصیحه بزرگ است.."** واتـە: **"بـەلای ئەوانـەوە کـە خـاوەنی ئاوەز و تێگەیشتنن، ئەو مانایەیان لا روون و ئاشـکرایە، کـە زمـانی کـوردی، لـە زمانـە رەوان و مەزنەکانەو.."**، کە ئەم بڕیارە بێ چەند و چوونەی ئەم رووناکبیرە کـوردە، لـە بەرامبەر دەسەلاّتێکی گەورە و هاوکات خوێندەوار و شاعیرێکی وەك (ناسـرەدین شـا)ی ئێرانـدا دەیکـات، کـە وەك وتـرا: لەسـەر راسـپاردەی ئـەم (شـا)یـە گەورەیـەش ئـەم فەرهەنگەی ئامادەکردووە، هاوتەرییش قایل کردنـی (ناسـرەدین شـا)شـە، بـەوەی کـە زمانی کوردی، زمانێکی مەزن و رەوانە.. ئەمەش خۆی لە خۆیدا تەقەللایەکی مەزنە، بـۆ

---

لە نموونەی فەرهەنگی دێرینەی فارسیش ئەمانـەن: ئەسـەدی توسـی، صـحاح الفـرس، لغـت فـرس... هتد.

(*) لەم بارەیەوە هەر بۆ نموونە بنواڕە: باغ بیدی، حسن رضائی: معرفی زبان ها و گویش های ایران، گروه گویش شناسی (فرهنگستان زبان و ادب فارسی)، اردیبهشت ۱۳۸۰ شمسی (نیسان ۲۰۰۱ز).

ئەوەی ئەو (شا)یە وا لێ بکات، بە چاوێکی جیاواز و خاوەن زمانێکی تایبەوە سەیری گەلی کورد بکات. بە واتەیەکی تر: تەقەللای تێگەیاندنی (دەربار)ی قاجاریشە، تا لە چاوی (ناسرەدین شا)وە بۆ زمانی کوردی بنواڕن.

بەلآم دوور لەمانەش، ئەم فەرهەنگە دەست پێشخەرییەکی دڵسۆزانەیە، بۆ نووسینەوەی فەرهەنگی کوردی، بەتایبەتی لە دەڤەرێکی وەك مەڵبەندی میرنشینی ئەردەلآندا، کە بۆ چەندان سەدە، ناوەندێکی درەوشاوەی فەرهەنگیی و بازرگانیی و شارستانێتیی هەمەرووی کوردەواری بووە و هەر بەم بۆنەیەشەوە واژەگەلی دیالیکت و بن دیالیکتەکانی: شارەزوور، هەورامان، کرماشان و لوڕستانی تێ ڕژاوە و نموونەی شێوەزاری ئەم دەڤەرانەش، کەم و زۆر لەم فەرهەنگە بچووك و پوختەدا کۆ دەبێتەوە، کە ئەم لایەنە، بۆ ئەو لێکۆڵەرانەی دەیانەوێ شوێن پێی پێشکەوتنی زمانی کوردی، لەم سەد ساڵەی دواییدا هەڵبگرن، بێ کەڵك نابێ، بەتایبەتیش بۆ هەندێ تیپی وەك (ح) و (ژ) و ئەو گۆڕانەی لەم سەد ساڵەدا لە رووی فۆنێتیکەوە بەسەریاندا هاتووە و لەم چەند نموونە واژەیەی ئەم فەرهەنگەدا بەرچاو دەکەون:

حەڵسە: لەباتی: (هەڵسە)ی ئێستا. ل ٤ی فەرهەنگ.

حەڵ گرتن: لەباتی: (هەڵگرتن)ی ئێستا. ل ٤ی فەرهەنگ.

حەڵسان: لەباتی: (هەڵسان)ی ئێستا. ل ٤ی فەرهەنگ.

حەناسەکێشان: لەباتی: (هەناسەکێشان)ی ئێستا. ل ٤ی فەرهەنگ.

حەڕاکردن: لەباتی: (هەڕاکردن)ی ئێستا. ل ٤ی فەرهەنگ.

حەڵپەڕین: لەباتی: (هەڵپەڕین)ی ئێستا. ل ٥ی فەرهەنگ.

حەڵمەت دان: لەباتی: (هەڵمەت دان)ی ئێستا. ل ٥ی فەرهەنگ.

حەڕك: لەباتی: (هەڕك، قوڕ)ی ئێستا. ل ٢٨ی فەرهەنگ.

یان واژەی: نذگەرە، لەباتی: (نزگەرە)ی ئێستا. ل ٩ی فەرهەنگ.

هەر لەم فەرهەنگەدا هەندێ واژەی دانسقە و دەگمەنی پاکی کوردی هەن، کە لە سەرجەمی فەرهەنگی چاپکراوی کوردیدا نین، وەك:

ـ بازی هەوا: فرفرۆکە. ل ٢٨ی فەرهەنگ.

ـ باروشه: باوەشێن. ل٢٨ ی فەرهەنگ.

ـ ترێشته: تەشویٚ، تەورزین. ل٢٩ ی فەرهەنگ.

ـ چۆخه بازەڵە: بەچکه بەراز. ل ٢٠ی فەرهەنگ.

ـ حالاٚو: جۆره شۆربایەکی کوردەواری بووه. ل ١٧ی فەرهەنگ.

ـ دەمارەکۆلٚ: دووپشك. ل ٢٩ی فەرهەنگ.

ـ رەنگاو: تریٚ، ناوی جۆرێك بووه له تریٚ. ل ١٦ی فەرهەنگ.

ـ کوولەکه سەراوی: جۆرێك له کوولەکه. ل ١٦ی فەرهەنگ.

ـ کەوك: شینکی، خۆڵەمێشیی (رەنگ). ل ٣٠ی فەرهەنگ.

ـ نان شاته: لەواشه (نان). له٣٠ی فەرهەنگ.

یان هەندیٚ تیپ، که به تێپەڕینی رۆژگار سواون و دواتریش لەگەلٚ واژەی دایکدا نەماون، وەك واژەی (ئەمرۆژ)، که ئێستاکه تیپی (ژ)ێیەکەی نەماوه و بۆته( :ئەمرۆ).

هەر لەم فەرهەنگەدا، بۆ جیاکردنەوەی تیپه دەنگداره قەڵەوەکانی وەك: (ۆ)، (یٚ)، (ڕ)، (لٚ) هەندیٚ هێما و نیشانەی داناون، که خوێنەر دوای خوێندنەوەی چەند لاپەڕەیەکی کەمی فەرهەنگەکە، زوو له مەبەستی نووسەر دەگات، وەك ئەوەی لەسەر (ر)ی قەڵەو، نیشانەی (شەددە)ی عەرەبی بۆ داناوه، یان بۆ (و) و (ی) درێژ و تیپی (بزوێن)، هێماکانی وەك (سەر، ژێر، بۆر)ی عەرەبی داناون.

له لاپەڕه (١٠تا١٣) ویستوویەتی باسی هەندیٚ واژەی (کار) بکات، که به دەم (گەردان)ەوه، ماناکانیان پێچەوانه دەبێتەوه.

له لاپەڕه (١٣–١٥)ش، هەندیٚ واژەی بەرچاو خستوون، که له کاتی بەکارهێنانیاندا وەك (کار)، ئاڵوگۆڕیان بەسەردا نایەت. هەر لەم فەرهەنگەدا تیپی (د)، له واژەی (کار)دا، به یەکجاریی سواوه و بەرچاو ناکەویٚ، وەك:

ـ سەنن، لەجیاتی: سەندن. ل٧ی فەرهەنگ.

ـ قیڕانن، لەجیاتی: قیڕاندن. ل٧ی فەرهەنگ.

ـ کولاٚنن، لەجیاتی: کولاٚندن. ل٨ی فەرهەنگ.

ـ کوژانن، لەجیاتی: کوژاندن. ل٨ی فەرهەنگ.

- لەوەڕانن، لەجیاتی: لەوەڕاندن. ل٩ی فەرهەنگ.
- شکانن، لەجیاتی: شکاندن. ل١٠ی فەرهەنگ.
- سەنی، لەجیاتی: سەندی. ل٣٧ی فەرهەنگ.
- رژانی، لەجیاتی: رژاند. ل٣٩ی فەرهەنگ.

## -٣-
## نووسەری ئەم فەرهەنگە

نووسەر لە دامێنی دوایین لاپەڕەی فەرهەنگەکەیدا، سەبارەت بەهۆی نووسینی فەرهەنگەکە و ناوی خۆی، هەر تەنیا ئەوەندەی نووسیوە، کە ئەم فەرهەنگە:

**"لەسەر فەرمانی سەرکاری بەندەگەل، بەرزترین حەزرەت، دەسەلات قەدەر، هومایۆنی سوڵتانی مەزنترین و خاقانی بەخشندەترین: ناسرەدین شای قاجار - خوا دەوڵەت و خاکەکەی بە زیندوویی رابگرێ، بە تەقەللا و کۆششی کەمترین خانەزادان: (ئەبولموحسین)ی پێشخزمەتی ئەردەلانی کوردستان نووسراوە. ساڵی ١٣٠٣کۆچی(*)".**

*فارسییەکەی:*

**١٣٠٣هـ**

**هو القادر المتعال**

**حسب الامر سرکار بندگان اعلیحضرت قدر قدر همیون السلطان الاعظم و الخاقان الاکرم ناصرالدین شاه قاجار خلّد الله ملکهُ و دولته، بسعی و اهتمام اقل خانەزادان ئەبو لموحسین پشخدمت اردلان کردستان.**

کە وەك لە نەریتی ئێراندا باوە، (ئەبولموحسین) نازناوی بنەماڵە دەگرێتەوە، نەك ناوی خودی کەسەکە. بۆیە زۆرم هەوڵدا، بزانم ئەم رووناکبیرە کوردە کێیە! نەمتوانی

(*) ١٨٨٥ز.

سۆراخی راستەقینەی هەڵبگرم. هەر چەندە بۆرە گومانێکی تەماویم لەوە هەیە، کە (ئەبولموحسین)، هەر (عەلی ئەکبەر وەقائیع نیگاری کوردستانی) بێ، کە فەرهەنگێکی بە ناوی (بدائع اللغە) نووسیوە و لەم ساڵانەی دواییدا دەستنووسەکەی، دەست هاورێم: مامۆستا محەمەد رەئوف تەوەکولی کەوت و ساغی کردەوە و چاپی کرد، دوای ئەویش مامۆستا (جان دۆست) ئەم فەرهەنگەی کردە عەرەبی و ساڵی ١٩٩٨ بە چاپی گەیاند.

هەر (ابولموحسین) لە لاپەڕەی یەکەمی فەرهەنگەکەیدا، ئەم پێشەکییە کورتەی بۆ نووسیوە:

**بەناوی خوای گەورە و میهرەبانەوە**

لەمە چاکتر، ئەو سوپاس و ستایشەیە، کە پیرۆزانی بڵند و تەژ و سیخناخ (لە زانست) و نزیکانی بارەگا، بە زمانی رەوان و چڕ و بەیان و ناواخن و ناوەرۆك پڕ لە رەوانبێژیی، پێی ئاخاوتوون، سوپاسی ئەو حەزرەتەیە، کە بوونی پێویست بووە و هەمەجۆر زمانی ئاشکرا و شاراوەی خۆی قووڵ کردۆتەوە و دیسان سوپاسی ئەو مەزنترین نیعمەتەیە، کە محەمەد مستەفا و ئیمامگەلی رێنوێنی ناردووە (سلاوی خوایان لێ بێت) و ئەم ئوممەتە بەزەیی پێداهاتووەی بە تایبەتمەندیی جیا جیاوە ئەفراندووە، چاکترین یادێکیش، کە فریشتانی نزیکی بارەگا و خواپەرستانی دڵسۆز و پاك، پێوەی سەر قاڵن ، درووده بۆ سەروەری پەیامبەران و ئیمامانی پاك (درووود و سلاوی خوا لە هەموویان بێت).

بەلام دوای ئەمە، بەلای ئەوانەوە کە خاوەنی ئاوەز و تێگەیشتنن، ئەو مانایەیان لا روون و ئاشکرایە، کە زمانی کوردی، لە زمانە رەوان و مەزنەکانە و تائێستاش بەو جۆرەی کە دەبووایە بکرابایە، نەنووسراوەتەوە. بۆیە بەگوێرەی فەرمان، ئەم بەندەی دەروازەیە، بەشێوەیەکی کورت و پوخت، ئەم کتێبەم نووسی ساڵی ١٣٠٣کۆچی.[1]

---

[1] ١٣٠٣کۆچی: ١٨٨٥زایینی.

فارسییەکەی:

## هذا کتاب لغات کُردی

## بسم الله الرحمن الرحیم

## هو

نیکوزین ثنائی که قدوسیان ملاء اعلی و مقرّبان بارگاه به زبان فصاحت مشحون و بیان و بلاغت مضمون بآن متکلّم کردند، حمد حضرت واجب الوجودیست که انواع لغتهای ظاهر و باطن مندهای خود را مستغرق گردانید و باعظم نعم که ارسال محمد مصطفی و ائمه هدی است سلام الله علیهم این امت مرحومه را اختصاص داده سرافراز ساخت و بهترین ذکری که ملائکه مقرّبین و عباد مخلصین بآن مشغول باشند درود بر سید المُرسلین و أئمه طاهرین صلوات الله و سلامه علیهم اجمعین است.

امّا بعد. بر رأی خداوندان عقل و زکا، اینمعنی ظاهر و هویداست زبانی کُردی، که از ألسنه فصیحه بزرگ است، تاحال بطوریکه باید نوشته نشده بود و لازم بود که این زبان رابەسهل ترین جهتی از برای اشخاصیکه بخواهند بیاموزند نوشته شود. لهذا حسب الامر، این بنده درگاه، بطور اختصار به تألیف این کتاب پرداخت در سنه ١٣٠٣هـ.

## ل3[*]

| | |
|---|---|
| ئاگردان[٢] | آتش زدن |
| بێزك كردن[٣] | بیادکردن و میل کردن |
| بێگار كردن | فعلکی کردن |
| بوون | بودن |
| بڕین | بریدن |
| بەڕگردان[٤] | جلوگیری کردن |
| بگرتون[٥] | گـذشتن |
| بەرزكردن | بلندکردن |
| بەركردن | پوشیدن |
| بارین | باریدن |
| بیركردن | فکرکردن |
| بەرەو پیری چوون | استقبال رفتن |
| برسی بوون | گرسنه شدن |
| پێكان[٦] | نیشانه زدن |
| بەرەڵلابوون | رهاشدن |

(*) ئەمانە ژمارەی زنجیرەی لاپەڕەکانی خودی فەرهەنگە دەستنووسەکەن.

(٢) ئاگردان: بەشێوەی (سنە) و لێرەدا مەبەستی (ئاگرتێبەردان) و (ئاگرکردنەوە)یە، نەك بـەگوێرەی ئەو پاشگری (دان)ەی کە (جێگە) واتە: (ظرف) دەگرێتـەوە و لـە کـوردی ئێـستادا دەبێتـە: وەجـاخ و کوورە و ئەو جۆرە (جێگا)یانەی ئاگریان تێدا دادەنرێ.

(٣) بێزك كردن: بێزووکردنی ئافرەتی دووگیان.

(٤) بەرگڕدان: پێش پێگرتن.

[٥] بگرتون: یان: بگرتن: چاوپۆشیی

[٦] پێکان: ئەنگاوتن، نیشانە شکاندن، لە ناو ئەم چەند پیتی (ب)یەدا، هەر ئەم واژەیە پیتی (پ)یە

**ل4**

**ـ ت ـ**

| | |
|---|---|
| تاودان | دوانیدن |
| تێربوون | سیرشدن |
| ترسین | ترسیدن |
| تاشین | تراشیدن |

**ـ ج ـ**

| | |
|---|---|
| جوانن | حرکت دادن |
| جینجکان دانیشتن | چمباتمه نشستن |

**ـ چ ـ**

| | |
|---|---|
| چوون | رفتن |
| چنین | چیدن |
| چەقانن | فردکردن |
| چڕانن[٧] | صداکردن |
| چەمانن | خم کردن |

**ـ ح ـ**

| | |
|---|---|
| حەڵ گرتن | برداشتن |
| حەڵسان | برخاستن |
| حەڕاکردن | دویدن |
| حەناسەکێشان | آه و خمیازه کشیدن |

**ل5**

| | |
|---|---|
| حەڵپەڕین | جستن |
| حەڵ هاوردن | حلّ معمّاکردن |
| حەڕگین بوون[٨] | گلی شدن |

---

(٧) چڕانن: بانگ کردن

(٨) حەرگین بوون: حەرك، یان هەرك: قوڕ.

| | |
|---|---|
| حەڵمەت دان | حمله کردن |

**- خ -**

| | |
|---|---|
| خواردن | خوردن |
| خستن | انداختن |
| خەفتن | خوابیدن |
| خورانن | خاریدن |

**- د -**

| | |
|---|---|
| دڕین | پارەکردن |
| دەرهاوردن | بیرون آوردن |
| داوەزین | پیادەشدی |
| دۆزین | پیداکردن |
| دوژن دان[٩] | فحش کردن |
| درۆ وتن | دروغ گفتن |
| دزین | دز دیدن |

ل6

| | |
|---|---|
| دوورانن[١٠] | دوختن |
| دانیان[١١] | باختن |
| دانیشتن | نشستن |
| دوامان[١٢] | عقب ماندن |
| دانەوان | خم کردن |
| دابردن | تحلیل بودن |
| دڕیان[١٣] | پارەشدن |

---

[٩] دوژن دان: جنێودان.

[١٠] دوورانن: دوورین، دوورینەوە، دوورمان.

[١١] دانیان: دانان، دۆڕاندن.

[١٢] دوامان: دواکەوتن.

**- ر -**

| | |
|---|---|
| رۆین | رفتن |
| رفانن[١٤] | ربودن و دوانیدن |
| رێگ چوون[١٥] | راه رفتن |
| روانین[١٦] | نگاه کردن |
| رژانن[١٧] | ریختن |
| رسین[١٨] | ریسیدن |
| رچیان[١٩] | منجمد شدن |

**- ز -**

| | |
|---|---|
| زینگی کردن[٢٠] | زندکی کردن |

ل7

| | |
|---|---|
| زانین | دانستن |

**- س -**

| | |
|---|---|
| سەرنج گرتن[٢١] | برآورد کردن |
| سەردانەواندن[٢٢] | تعظیم کردن |

---

[١٣] درپیان: درپین.

[١٤] رفانن: رفاندن.

[١٥] ) رێگ چوون: رێگا رۆیشتن.

[١٦] روانین: روانین، سەیر کردن.

[١٧] رژانن: رژاندن.

[١٨] رسین: رستن.

[١٩] رچیان: رچین، لەگۆچوون (لە سەرمادا).

[٢٠] زینگی کردن: زیندەگی کردن، ژیان.

[٢١] سەرنج گرتن: سەرنجدان، بەراورد کردن.

[٢٢] سەردانەواندن: بۆ رێز لێنان لە کەسێك.

| | |
|---|---|
| سەنن | خریدن = گرفتن |
| **ـ ش ـ** | |
| شێوانن | بهم زدن، مخلوط کردن |
| شێلان | مالیدن |
| شەلین | لنگیدن |
| شاردن[٢٣] | پنهان کردن |
| **ـ غ ـ** | |
| غار کردن[٢٤] | چهار نعل کردن اسب |
| **ـ ف ـ** | |
| فڕین | پریدن |
| فرەکردن[٢٥] | أفزودن |
| فێربوون | آموختن |
| فرۆتن[٢٦] | فروختن |
| فڕەدان[٢٧] | دورأنداختن |
| **ـ ق ـ** | |
| قیڕانن[٢٨] | فریاد زدن |

**ل8**

| | |
|---|---|
| قۆزین[٢٩] | سرفه کردن |
| قاو کردن[٣٠] | صداکردن |

---

[٢٣] شاردن: شاردنەوە.

[٢٤] غار کردن: غار کردنی چوار ناڵەی ئەسپی مەبەستە.

[٢٥] فرەکردن: پتر کردن، زیاتر کردن.

[٢٦] فرۆتن: فرۆشتن.

[٢٧] فڕەدان: فڕێدان.

[٢٨] قیڕانن: قیڕاندن.

[٢٩] قۆزین: کۆکین، قۆزەکردن.

ـ ك ـ

| | |
|---|---|
| کەفتن[٣١] | افتادن |

ـ گ ـ

| | |
|---|---|
| گیریان[٣٢] | گریه کردن |
| گمیز کردن[٣٣] | ادرار کردن |

ـ ك ـ

| | |
|---|---|
| کوناکردن[٣٤] | سوراخ کردن |
| کولآنن[٣٥] | پختن |

ـ گ ـ

| | |
|---|---|
| گەیین[٣٦] | رسیدن |
| گزك دان[٣٧] | جاروب کردن |
| گان کردن | جماع کردن |

ـ ك ـ

| | |
|---|---|
| کاوێژ کردن | نشخار کردن |
| کوژانن[٣٨] | خاموش کردن |
| کێلآن | کاشتن(*) |

---

(٣٠) قاوکردن: بانگ کردن.

(٣١) کەفتن: کەوتن.

(٣٢) گیریان: گریان.

(٣٣) گمێز کردن: میزکردن.

(٣٤) کوناکردن: کون کردن.

(٣٥) کولآنن: کولآندن.

(٣٦) گەیین: گەیشتن

(٣٧) گزك دان: گسك دان.

(٣٨) کوژانن: کوژاندن.

**ـ گ ـ**

| | |
|---|---|
| گۆرانی چڕین | آوازه خواندن |

**ـ ك ـ**

| | |
|---|---|
| کەنین[٣٩] | خندیدن |
| کڕانن | کندن روی زخم |

**ل9**

**ـ ل ـ**

| | |
|---|---|
| لەقەقەخستن[٤٠] | لگد انداختن |
| لەدان[٤١] | زدن |
| لەنیان[٤٢] | بارکردن |
| لەتەك بوون[٤٣] | همراه بودن |
| لەرزین | لرزیدن |
| لەوەڕانن | چرانیدن |
| لەوەڕین | چریدن |
| لێسین[٤٤] | لیسیدن |
| لەبیرچوون | فراموش کردن |
| لەبەرچوون[٤٥] | جلو رفتن |

---

[*] کاشتن: کە بەرامبەر (کێلاّن)ی کوردی نووسراوە، بە مانای (چاندن) دێت نەك (کێلاّن)، کە ماناکەی بە فارسی دەکاتە: شخم کردن، یان: شخم زدن.

[٣٩] کەنین: پێکەنین.

[٤٠] لەقەقەخستن: جووتە هاویشتن.

[٤١] لەدان: لێدان.

[٤٢] لەنیان: لێنان، بەلاّم مەبەستی (بارلێنانی ولاّخە).

[٤٣] لەتەك بوون: لەگەڵدا بوون.

[٤٤] لێسین: لستنەوە، لێسینەوە.

[٤٥] لەبەرچوون: لەپێشەوە ڕۆیشتن.

- م -

| | |
|---|---|
| مەلآزبردن[٤٦] | كمين كردن |
| مەلە كردن | شناكردن |

- ن -

| | |
|---|---|
| نويسين | نوشتن |
| نذگەرە كردن[٤٧] | سكسكە كردن |

ل10

| | |
|---|---|
| نوژكردن | غاز كردن |
| نەچێر چوون | شكار كردن |

- و -

| | |
|---|---|
| وتن | گفتن |
| وەك يەك بوون | مساوى بوون |
| وێسان[٤٨] | ايستادن |

- ه -

| | |
|---|---|
| هاتن | آمدن |
| هەژار بوون | فقيرشدن |
| هەناردن | فرستادن |

- ش -

| | |
|---|---|
| شكانن | شكستن |

---

[٤٦] مەلآزبردن: بۆسە نانەوە، خۆ لە بۆسەنان.

[٤٧] نذگەرە كردن: نزگەرە كردن، كە پيتى (ذ) تا درەنگانێكيش لەناوچەی ئەردەلآن بەگشتى و هەورامان بەتايبەتى، لەجياتى پيتى (ز) بەكاردەبرا، كە ئێستا وا نەماوە و پيتى (ز) وەك خۆى بەكاردەبرێ.

[٤٨] وێسان: وەستان.

**ئەو واژەی کارانەی بەگوێرەی ڕێزمان گەردان دەکرێن، ئەوانەن کە هەر کاتێ بویستریێ بکرێنە (نەرێ)، (نا)یەکیان بۆ دەکرێتە (پێشگر)، وەك ئەم شێوەی لە خوارەوە باس دەکرێ.**

**(افعالیکه از روی قاعده صرف میشوند، اینها هستند هرگاه بخواهند نفی و نهی و جحد بنانمایند، یك (نا) اضافه میشود بطریقیکه ذکر خواهد شد)**

دانیشتن نشستن

من دائەنیشتم تۆ دائەنیشی ئەو دائەنیشێت ئێمە دائەنیشین

من می نشینم تو می نشینی او می نشیند ما می نشینم

ئێوە دائەنیشن ئەوان دائەنیشن من دانیشتم تۆ دائەنیشی

شما نشینید ایشان نشستند من نشستم تو نشستی

ئەو دانیشت ئێمە دانیشتین ئێوە دانیشتن ئەوان دانیشتن

او نشست ما نشستیم شما نشستید ایشان نشستند

من دانیشتگم تۆ دانیشتگی ئەو دانیشتگە ئێمە دانیشتگین

من نشستەام تو نشستید او نشستەاست ما نشستەایم

ئێوە دانیشتگن ئەوان دانیشتگن من دانیشم تۆ دانیشی

شما نشستەاید ایشان نشستەاند من می نشینم تو بەنشین

| ئەو دانیشت | ئێمە دانیشین | ئێوە دانیشن | ئەوان دانیشن |
|---|---|---|---|
| او بەنشیند | ما بەنشینم | شما بەنشنید | ایشان بەنشینند |
| | دانیشە | | دانیشن |
| | بنشین | | بنشیند |

## ل12

کێڵان — کاشتن

| من ئەکێڵم | تۆ ئەکێڵی | ئەو ئەکێڵێ | ئێمە ئەکێڵین |
|---|---|---|---|
| من میکارم (*) | تو میکاری | او میکارد | ما میکاریم |

| ئێوە ئەکێڵن | ئەوان ئەکێڵن | من کێڵام | تۆ کێڵات |
|---|---|---|---|
| شما میکارید | ایشان میکارند | من کاشتم | تو کاشتی |
| ئەو کێڵای | ئێمە کێڵامان | ئێوە کێڵاتان | ئەوان کێڵایان |
| او کاشت | ما کاشتیم | شما کاشتید | ایشان کاشتند |

| من ئەیکێڵم | تۆ ئەیکێڵی | ئەو ئەیکێڵێ | ئێمە ئەیکێڵین |
|---|---|---|---|
| من خواهم کاشت(*) | تو خواهی کاشت | او خواهد کاشت | ما خواهیم کاشت |

---

(*) من ئەکێڵم: ماناکەی بە فارسی ناکاتە: من میکارم. چونکە (میکارم) بۆ: نەمام ناشتنە، بەڵام (من شخم می زنم) یەکسەر دەکاتە مانای کوردی (من ئەکێڵم).

(*) من خواهم کاشت: ئەمە لە فارسیدا هەر بۆ (داهاتوو) دەبێ، بەڵام لە کوردیدا (داهاتوو) بۆ ئێستا و بۆ داهاتووشە. لەبەرئەوە مانای (من خواهم کاشت) مانای تەواوی (من ئەیکێڵم) ناگرێتەوە. بەم پێیە ئەو واژەگەلە فارسییانەی تریش کە بە (خواهم، خواهی، خواهد، خواهیم، خواهید، خواهند)ن، هەموویان بۆ (داهاتوو) دەبن، نەك بۆ (ئێستا). لەکاتێکدا وەك وتمان لە کوردیدا (داهاتوو) بۆ ئێستا و داهاتووشە. بۆیە لە پەرەگرافی دوایشدا و لە بەرامبەر واژەی (دانیشتن) و ئاڵوگۆڕەکانیدا، هەمان: نخواهم، نخواهی، نخواهد، نخواهیم، نخواهید، نخواهند) هەر تەنیا بۆ (داهاتوو = مضارع)ن.

ئێوه ئەیکێڵین    ئەوان ئەیکێڵین    من کێڵاگم    تۆ کێڵاگته

شما خواهیدکاشت    ایشان خواهند کاشت    من کاشته ام    تو کاشته

ئەو کێڵاگی    ئێمه کێڵاگمان    ئێوه کێڵاگتان    ئەوان کێڵاگیان

او کاشته‌است    ما کاشته‌ایم    شها کاشته‌اید    ایشان کاشته‌اند

بکێڵه    بکێڵن

بکار    بکارید

**ل13**

دانیشتن    نشستن

فعل جحد

من دانانیشم    تۆ دانانیشی

من نخواهم نشست    تو نخواهی نشست

ئەو دانانیشێت    ئێمه دانانیشین

او نخواهد نشست    ما نخواهیم نشست

ئێوه دانانیشن    ئەوان دانانیشن

شما نخواهید نشست    ایشان نخواهند نشست

مەنیش    مەنیشن

منشین    منشینید

من نایکێڵم    تۆ نایکێڵی    ئەو نایکێڵی    ئێمه نایکێڵین

من نخواهم کاشت    تو نخواهی کاشت    او نخواهد کاشت    ما نخواهیم کاشت

| ئەوان نایکێڵن | ئێوە نایکێڵن |
|---|---|
| ایشان نخواهند کاشت | شما نخواهید کاشت |
| مەکێڵن | مەکێڵە |
| مکارید | مکار |

ل14

## ئەو واژەی کارانەی، کە بەگوێرەی رێزمان گەردان ناکرێن

## (افعالیکه از روی قاعده صرف نمیشود)

| وتن | گفتن | |
|---|---|---|
| من ئێژم | تۆ ئەیژی | ئەو ئێژێت |
| من میگویم | تو میگوئی | او میگوید |
| ئێمە ئێژین | ئێوە ئێژن | ئەوان ئێژن |
| ما میگوئیم | شما میگوئید | ایشان میگویند |
| من وتم | تۆ وتت | ئەو وتی |
| من گفتم | تو گفتی | او گفت |
| ئێمە وتمان | ئێوە وتتان | ئەوان وتیان |
| ما گفتیم | شما گفتید | ایشان گفتند |
| من وتگمە | تۆ وتگتە | ئەو وتگیە |
| من گفتەام | تو گفتەای | او گفتەاست |

| ئەوان وتگیان | ئێوە وتگتان | ئێمە وتگمان |
|---|---|---|
| ایشان گفتەاند | شما گفتەاید | ما گفتەایم |

| بێژن | بێژە |
|---|---|
| بگوئید | بگو |

**ل15**

## ئەو واژەی کارانەی بەگوێرەی رێزمان گەردان ناکرێن

## (افعالیکه صرف نمیشود)

| باری | ئەوارێ | باریگە | بارین |
|---|---|---|---|
| بارید | میبارد | باریدەاست | باریدن |
| رچیاگ | رچیا | ئەرچێ | رچیان |
| منجمد شداەست | منجمد شد | منجمد میشود | منجمد شدن |

| ئەگەیێ | گەییگە | گەیی | گەیین |
|---|---|---|---|
| خواهد رسید | رسیدە | رسید | رسیدن میوە |

| کاوێژ ئەکا | کاوێژ کردن |
|---|---|
| نشخار میکند | نشخار کردن |

| فرِیگە | فرِی | ئەفرِێ | فرِین |
|---|---|---|---|
| پریدەاست | پرید | خواهد پرید | پریدن |

| لەوەرِیگە | ئەلەوەرِێ | لەوەرِی | لەوەرِین |
|---|---|---|---|

| چریدن | چرید | میچرد | چریده |
|---|---|---|---|
| لەقە خستن | لەقە ئەخا | لەقەی خست | لەقەی خستگە |
| لگد انداختن | لگد میاندازد | لگد انداخت | لگد انداختەاست |

**ل16**

| **خواردەمەنی** | **خوراکی** |
|---|---|
| **ئاو** | **آب** |
| **حەمرو** [٤٩] | **گُلابی** |
| **کاڵەك** | **خربوزە** |
| **هەننی** [٥٠] | **هندوانە** |

---

[٤٩] حەمرو: هەمرو، هەرمێ. واژەکەش لە بنەڕەتدا بە هـەمان مانـای (هـەرمێ)ی فارسـییە و ئـەمجۆرە ئاڵوگۆڕەی بەسەرداهاتووە: ئەمروود= هەمروود هـەمروو = حـەمروو. ئێستاکەش لـە دەڤـەری سـنە و ئەردەڵاندا، دووبارە تیپی (ح)ی حەمروو، بۆتەوە بە: (هـ = هـەمروو)، کـە ئـەمجۆرە ئـاڵوگۆڕە لـەنێوان هەردوو زمانی کوردی و فارسیدا، لە زۆر لە نموونەی ئەو واژانەدا دەبینرێن، کە سەرەتاکانیان بە تیپـی (ئەلف) دەست پێدەکەن، وەك ئەم نموونانە:

١ـ ابرو: هەور

٢ـ ارزان: هەرزان

٣ـ انار: هەنار

٤ـ انجیر: هەنجیر

(*) بۆ نموونـە بـەکارهێنانی ئـەم واژەی (امـرود)ە، لـە نووسـینی کـۆنی فارسـیدا، بنـواڕە: سمرقندی، نظامی عروضي، چهار مقالـە عروضـی، شـرح و توضـیح: د. رضـا انزانـی نـژاد و د. سـعید قرەبگلو، انتشارات جامی، چاپخانە نیل، چاپ اول ١٣٧٦ش، ص٧٧، بەڵام لە ئێستای زمانی فارسـیدا ئەم واژەیە بەکارناهێنرێ، بەڵکو بە هەرمێ دەڵێن (گلابی).

[٥٠] هەنني: هەنی، شووتی.

| | |
|---|---|
| سێف[٥١] | سیب |
| گوز[٥٢] | گردو |
| بەلاڵووك | آلبالو |
| شلاّنە[٥٣] | زردآلو |
| سرینچك[٥٤] | سنجد |
| هەنگون[٥٥] | عسل |
| كولەكە | كدو |
| ئالّەت[٥٦] | فلفل |
| كولەكەی سەراوی[٥٧] | كدو قلیانی |
| خوا[٥٨] | نمك |

**ل17**

| | |
|---|---|
| شەلەمین[٥٩] | یك نوع آش شلغم |

---

[٥١] سێف: سێو.

[٥٢] گوز: گوێز. كە ئێستا لە (كۆیە)ش هەر (گووز)ی پێدەڵێن و لە كۆنیشدا لە زمانی فارسیدا هەر (گوز)یان پیّ وتووە.

[٥٣] شلاّنە: قەیسی.

[٥٤] سرینچك: سنجوو.

[٥٥] هەنگون: هەنگوین.

[٥٦] ئالّەت: بیبەر.

[٥٧] كولەكەی سەراوی: كولەكەی گەورە.

[٥٨] خوا: خویّ.

[٥٩] شەلەمین: شۆربای شێلم.

| | |
|---|---|
| حالاّو[٦٠] | آبگوشت ترش |
| ڕەنگاو[٦١] | أنگور را نوعى ميگويند |
| هێلکە ڕۆن[٦٢] | نيمرو |
| چێشت | پختنى |
| فرۆ | آغوز |
| ڕۆن | روغن |
| هێلکە | تخم مرغ |
| کەڕە[٦٣] | شير بستە |
| نۆك | نخود |
| نيسك | عدس |
| هەشتالّوو[٦٤] | هلو |
| گزەر | زردك |
| سياوڵە[٦٥] | سيادانە |
| کووزەڵە | بالاقوتى |

---

(٦٠) حالاّو: گۆشتاوى شێلم.

(٦١) ڕەنگاو: جۆرە ترێيەكە.

(٦٢) هێلکە ڕۆن: هەر مەبەست لە (هێلکە و ڕۆن)ە.

(٦٣) کەڕە: شيرى مەييو.

(٦٤) هەشتالّوو: قۆخ، خۆخ.

(٦٥) سياوڵە: لە کوردستانى عيراق (ڕەشکە)ى پێدەڵێن لەگەڵ (شملّى)دا، بۆ خۆشکردنى تام و بۆنى نان لەپێش برژاندنى نانەکەدا، دواى پان کردنەوەى (گونك)ەکە، پێوەى دەکرێ.

| | |
|---|---|
| مەویژ[٦٦] | کشمش |
| کولێر | نان گرده |

**ئاژەڵ و باڵندە**

**(حیوانات وطیور)**

| | |
|---|---|
| کەڵەشێر | خروس |
| مریشك | مرغ |
| فرِوج | جوجه |
| جورِه | کاکلی |
| قشقەرِه[٦٧] | زاغی |
| گاوانی | مار خالدار |
| قالاّو | کلاّغ |
| گەو[٦٨] | کبك |
| بارِ | قرەکبك |
| کورِکورِ | باقرقره |
| قولْنگ | درنا |

---

(٦٦) مەویژ: مێوژ.

(٦٧) قشقەرِه: قەلەباچکە.

(٦٨) گەو: کەو.

| | |
|---|---|
| مەلیچك[٦٩] | گنجشك |
| **ل19** | |
| سوسك[٧٠] | كبك چیل |
| هەڵوو[٧١] | قرەقوش |
| ئابڵن | سیار ابلق |
| کەرسەر[٧٢] | یکنوع مرغ آبی |
| کۆتر | کبوتر |
| سۆنە[٧٣] | أردك |
| هەنگ | زنبور عسل |
| واشە | قرقی |
| سەقر | چرغ |
| مێشەسی[٧٤] | میش مرغ |
| فیسقە | سوسك |
| پەپووسلێمانە | هدهد |
| هەلەکە سەما | دلیجە |

---

[٦٩] مەلیچك: چۆلەکە.

[٧٠] سوسك: سوێسکە.

[٧١] هەڵوو: هەڵۆ.

[٧٢] کەرسەر: جۆرە باڵندەیەکی ئاوییە، وەك مراوی.

[٧٣] سۆنە: مراوی.

[٧٤] مێشەسی: چێرگ، چرگ.

| | |
|---|---|
| قنگ هەڵتەکێنە | دم جمبانك |
| سوورە مۆزە[٧٥] | زنبور قرمز |
| ل20 | |
| کیسەڵ | لاك پشت |
| رێوی | روباه |
| چەقەڵ | شغال |
| بەور | ببر |
| ورچ | خرس |
| یەکانە[٧٦] | گراز |
| چوخە بازەڵە[٧٧] | بچه خوك |
| ژووژوو[٧٨] | جوجه تیغی |
| تانجی | تازی |
| کەورێشك[٧٩] | خرگوش |
| ل20 | |
| کتك[٨٠] | گربه |

(٧٥) سوورە مۆزە: ژەنگە سوورە، سیمە مۆزە.

(٧٦) یەکانە: بەرازی نێر.

(٧٧) چوخە بازەڵە: بەچکەی بەراز.

(٧٨) ژووژوو: ژیشك.

(٧٩) کەورێشك: کەروێشك.

(٨٠) کتك: پشیلە.

| | |
|---|---|
| ماسی | ماهی |
| ماسی قاشانی | ماهی آزاد |
| کشکه سەر | حیوان سیاکوچك در آب |
| **ل21** | |
| مارمزوك[(٨١)] | سوسمار |
| قومقومه | بزمجه |
| پەز | گوسفند |
| بزن | بُز |
| بەرخ | برّه |
| بەران | قوچ |
| شەك | شیشك |
| کاوڕ | تقلی |
| ساورێن[(٨٢)] | گل بُز |
| کار | بُزغاله |
| گێسك چتور | چپش |
| مایین | مادیان |
| گورکه[(٨٣)] | گوساله |

(٨١) مارمزوك: مارمێلکه.

(٨٢) ساورێن: سابرێن.

(٨٣) گورکه: گوێرەکه.

| | |
|---|---|
| گەماڵ | سگ |
| دەڵ | سگ ماده |
| **ل22** | |
| توته کۆڵه | کوته طوله |
| کێچ | کیك |
| سپێ[٨٤] | شپش |
| وشتر | شتر |
| کەر | خر |
| هێسر | قاطر |
| جەیران[٨٥] | آهو |

### ئەندامەکانی لەش
### (اعضای بدن)

| | |
|---|---|
| تیوڵ[٨٦] | پیشانی |
| چاو | چشم |
| مل | گردن |

---
(٨٤) سپێ: ئەسپێ.

(٨٥) جەیران: ئاسك، مامز.

(٨٦) تیوڵ: تەوێڵ، ناوچاوان، پێشانیی.

| | |
|---|---|
| شان | شانه |
| وژنگ[٨٧] | زانو |
| كلك[٨٨] | أنگشت |
| ل23 | |
| سمێڵ | سبیل |
| دەم | دهان |
| برۆ | ابرو |
| گوپ | لپ |
| لچ | لب |
| چناگه | چانه |
| كوچكه[٨٩] | گوش |
| ل23 | |
| زوان | زبان |
| قوڕگ | گلو |
| دگان[٩٠] | دندان |
| ناووك | ناف |

[٨٧] وژنگ: ئەژنۆ، زرانی(سنەی ئێستا).

[٨٨] كلك: پەنجە، قامك.

[٨٩] كوچكە: گوێچكە.

[٩٠] دگان: ددان، دیان (ئێستای سنە).

| | |
|---|---|
| لووت | دماغ |
| قنگانیسك[٩١] | مرفق |
| كلك توتەڵەته[٩٢] | انگشت کوچك |
| برژانك | مژه |
| **ل24** | |
| سینك[٩٣] | سینه |
| مەمكه | پستان |
| باڵ | بازو |
| سپڵ | اُسپل |
| جەرگ | جگر |
| گەدگ[٩٤] | شكمبه |
| زاوور[٩٥] | زهره |
| رێڵەخۆ[٩٦] | روده |
| سی | جگر سفید |
| زك | شكم |

(٩١) قنگانیسك: ئانیشك.

(٩٢) كلك توتەڵەته: پەنجەی بچووك.

(٩٣) سینك: سنگ.

(٩٤) گەدگ: ورگ.

(٩٥) زاوور: زراو، زەروو، زاڵه (ئێستای سنه).

(٩٦) رێڵەخۆ: ریخۆڵه.

| | |
|---|---|
| وڵك[٩٧] | قليه |

## ڕۆژان و شەوان

## (ايام وليالى)

| | |
|---|---|
| ئەمڕۆژ | امروز |
| سۆزى[٩٨] | فردا |
| دوو سۆ[٩٩] | پس فردا |

ل25

| | |
|---|---|
| سەسۆ[١٠٠] | پس دو فردا |
| ئيمشۆ | امشب |
| سۆزى شۆ | فردا شب |
| دوو سۆشۆ[١٠١] | پس فردا شب |
| دوێشۆ | ديشب |
| ئيسه[١٠٢] | الآن |
| چته بەر لەمه[١٠٣] | لحظه قبل |

(٩٧) وڵك: گورچيله.

(٩٨) سۆزى: سبەينێ.

(٩٩) دوو سۆ: دوو سبەى.

(١٠٠) سەسۆ: سێ سبەى.

(١٠١) دوو سۆشۆ: دووسبەى شەو.

(١٠٢) ئيسه: ئێستا.

**پۆشاك**

**(لباس)**

| | |
|---|---|
| **كلاو** | **كلاه** |
| **كەوا** | **قبا** |
| **كراس** | **پیراهن** |
| **شواڵ**[(١٠٤)] | **زیرجامه** |
| **هەوەجنه**[(١٠٥)] | **بند زیرجامه** |
| **گۆروا**[(١٠٦)] | **جوراب** |
| **بەڕ** | **كلیم، جاجم** |
| **ل26** | |
| **كەوش** | **كفش** |

**كەرەسەی ئەسپ**

**(اسباب اسپ)**

| | |
|---|---|
| **تورەكه** | **توبره** |

---

(١٠٣) چته بەر لەمە: شتێك بەر لە ئێستا.

(١٠٤) شواڵ: دەرپێ.

(١٠٥) هەوەجنه: بەندە خوێن.

(١٠٦) گۆروا: گۆرەوی.

| | |
|---|---|
| وزەنگی[١٠٧] | ركاب |
| لەغاو | لجام |
| دگانە | دهنه |
| ركێف دواڵ[١٠٨] | بند ركاب |
| نەوگ[١٠٩] | نمد |
| كۆپان | پالان |

**رەگەز**

**(اقوام)**

| | |
|---|---|
| پیاگ[١١٠] | مرد |
| ژن | زن |
| مناڵ | بچه |
| كەنیشك | دختر |
| وەوی[١١١] | عروس |
| خەسوو | مادر زن |

---

[١٠٧] وزەنگی: ئاوزەنگی.

[١٠٨] ركێف دواڵ: ئاوزەنگی.

[١٠٩] نەوگ: لباد.

[١١٠] پیاگ: پیاو.

[١١١] وەوی: بووك، وەی وە(هەورامان).

| ل27 | |
|---|---|
| برا | برادر |
| میمك | عمه |
| مامۆ | عمو |
| شوو[١١٢] | شوهر |
| خەزوورە | پدر شوهر |
| خویشك | خواهر |
| زاوا | داماد |
| باوك | پدر |
| دایك | مادر |
| خالۆ | دائی |

**واژەی جیاواز**

**(لغات مختلفه)**

| | |
|---|---|
| چۆپی | رقص |
| تالْ | تلخ |
| باروشە[١١٣] | بادبزن |
| وشك | خشك |

---

[١١٢] شوو: هاوسەر (مەبەست لە مێردە).

[١١٣] باروشە: باوەشێن.

ل28

| | |
|---|---|
| کوچك[114] | سنگ |
| حەڕك[115] | گل |
| تۆز | گرد |
| خۆڵ | خاك |
| دووكەڵ | دود |
| حەوش | حياط |
| گولاڵە سوورە | شقايق |
| پوونگە | پودينه |
| بازی هەوا[116] | بادبدك |
| لێف[117] | لحاف |
| قوێخا[118] | كدخدا |
| سۆڵ[119] | شور |
| سڵ | رم |

---

(114) کوچك: بەرد.

(115) حەڕك: هەڕك، قوڕ.

(116) بازی هەوا: فڕفڕۆكە.

(117) لێف: لێفە.

(118) قوێخا: كوێخا.

(119) سۆڵ: سوێر.

| گەورە | بزرگ |
|---|---|
| بوچیك | كوچك |
| ل29 | |
| جاوك[١٢٠] | كرباس |
| گوریس | ریسمان |
| دەمارە كۆڵ[١٢٢] | عقرب |
| خولآمانە[١٢٢] | زلف |
| پەلكە | گیسو |
| گۆزەڵە | كوزە |
| ڕێگە | راه |
| كەل | كتل |
| كێف[١٢٣] | كوه |
| دۆڵ | درّە |

---

[١٢٠] جاوك: كراس لە جاوی چنراو.

[١٢٢] دەمارە كۆڵ: دووپشك.

[١٢٢] خولآمانە: غولآمانە، كاكۆڵ، جۆرێكی تایبەتی كۆكردنەوەی قژە سەرە لەپشت گوێوە، كە لەو سەردەمەدا لەناو كچان و لاوان و پیاوانی كورددا باوبووە،"مەحوی"ی شاعیر واژەی "غولآمانە"ی بەمجۆرە بەكاربردووە:

**غولآمانە سەرم دانا لەبەر پێیا، وەكو زلْفی**

**كەچی ئەو، هەر منی خستۆتە پشت گوێ، وەك: غولآمانە.**

(دیوانی مەحوی، مەلا كەریمی مودەڕیس، ل٢٧٧).

[١٢٣] كێف: كێو، چیا.

| | |
|---|---|
| چەمچە[١٢٤] | قاشق |
| ترێشتە[١٢٥] | تیشە |
| زل | بزرگ |
| گەزۆ | گرنگبین |
| دار | درخت |
| **ل30** | |
| هاوار | صدا |
| نان شاتە(شاطە)[١٢٦] | نان لواش |
| خۆرەتاو | آفتاب |
| مانگ | ماه |
| هەسارە[١٢٧] | ستارە |

---

[١٢٤] چەمچە: کەوچك. بەڵام جۆرە کەوچکێکی قووڵە، بۆ دەرهێنانی شلەمەنی لە مەنجەڵ و دەفر و تێداندا. ئەم واژەیە لە دێرزەمانەوە شاعیری گەورەی فارس (سەعدی شیرازی) بەمجۆرە لە شیعرێکیدا بەکاری بردووە:

**غریبی گرت ماست پیش آورد**
**دو پیمانه ئَبست و یك (چمچە) دوغ**
**اگر راست میخواهی از من شنو**
**جهان دیده بسیار گوید دروغ**

(کلیات سعدی: گلستان سعدی، موسسه انتشارات امیر کبیر، چاپ هشتم ١٣٦٩ش، چاپخانه سپهر، تهران، ص٦٥) ئەم واژەیە ئێستا لە زمانی تورکیدا بە هەمان مانای کەوچك بەکاردێت.

[١٢٥] ترێشتە: تەشوێ، تەورزین، تەوشی (هەولێر).

[١٢٦] نان شاتە( شاطە): لەواشەی نانە.

[١٢٧] هەسارە: ئەستێرە.

| | |
|---|---|
| کەوك[١٢٨] | کبود |
| چەرمك[١٢٩] | سفید |
| رەش | سیاه |
| سوور | قرمز |
| کلکەوانە[١٣٠] | انگشتانە |

## گفتوگۆ

## (مکالمات)

| | |
|---|---|
| خۆشی شوکر! | انشاء الله احوال شما خوب است |
| ئەحواڵی ئێوە چلۆنە؟ | احوال شما چــطوراست؟ |
| لە سایەی تۆ | از التفات شما |
| خاسە | خوب است |
| ل31 | |
| لە کوێنە بوون؟[١٣١] | کجا تشریف داشتید؟ |
| تاسەتم کردوو | دلم برای شما تنگ شده بود |

---

(١٢٨) کەوك: شینکی(رەنگ).

(١٢٩) چەرمك: سپی.

(١٣٠) کلکەوانە: مووستیلە.

(١٣١) لەکوێنە بوون: لە کوێ بوون؟

| | |
|---|---|
| کویّ ئەچین؟[١٣٢] | کجا میرید؟ |
| لە کوێنەتێن؟[١٣٣] | از کجا میآئید؟ |
| بۆ کویّ ئەچین؟ | خیال رفتن کجارا دارید؟ |
| بێرە ئەگرە[١٣٤] | بیا اینجا |
| بڕۆ ئێینە[١٣٥] | برو انجا |
| حەڵسە[١٣٦] | برخیز |
| دانیش | بنشین |
| قاوتون ئەخۆن؟[١٣٧] | نهار میخورید؟ |
| شامیان خستگە[١٣٨] | شام حاضراست |
| بۆچە قسە ناکەی؟ | چرا حرف نمیزنید؟ |
| چە ئەکەی؟ | چە میکنید؟ |
| مناڵەکان چلۆنن؟ | احوال بچها چطوراست؟ |
| مەنزڵتان ها لە کویّ؟[١٣٩] | منزل شما کجا است؟ |

[١٣٢] کویّ ئەچین: بۆ کویّ ئەچن.

[١٣٣] لە کوێنەتێن: لە کوێوە دێن؟

[١٣٤] بێرە ئەگرە: وەرە ئێرە.

[١٣٥] بڕۆ ئێینە: بچۆ ئەویّ.

[١٣٦] حەڵسە: هەڵسە.

[١٣٧] قاوتون ئەخۆن: نانی نیوەڕۆ دەخۆن؟

[١٣٨] شامیان خستگە: نانی ئێوارە ئامادەیە.

[١٣٩] مەنزڵتان ها لە کویّ: ماڵتان لە کوێیە؟

## ل32

| | |
|---|---|
| ها لەو بەرۆ | آنطرف است |
| ها لە ژووروو[١٤٠] | سمت بالا است |
| ها لەم بەرۆ | این سمت است |
| ها لەم لاو | طرف یمین است |
| ها لە خوارەو | طرف پایین است |
| گان تۆ[١٤١] | جان شما |
| تۆم بمری | مرگ شما |
| هەرواسە[١٤٢] | همینطوراست |
| درۆ نایژم | دروغ نمیگویم |
| گمبە[١٤٣] | گمشو |
| هەڵترِیٚ[١٤٤] | جهنم شو |
| باواهیز | پدرسوختە[*] |
| برسیمە | گرسنە هستم |

---

[١٤٠] ) ها لە ژووروو: وا لە سەرەوە.

[١٤١] گان تۆ: گیانی تۆ(سوێندە).

[١٤٢] هەرواسە: هەروایە.

[١٤٣] گمبە: لاچۆ لەر چاوم.

[١٤٤] هەڵترِیٚ: بە دۆزەخ بچیت، جێگەت دۆزەخ بێت( دوعا و جنێوە).

[*] لە راستیدا (پدرسوختە) مانای (باواهیز) ناگرێتەوە، بەڵام (پدرسوختە)ش جنێوێکی توند و زبرە و مانا تەواوەکەی بە کوردی دەبێتە (باوك سووتاو).

| | |
|---|---|
| تێرم | سیرم |
| بچینه نەچیر[١٤٥] | برويم شكار |
| **ل33** | |
| بیکوژه[١٤٦] | بزنش |
| وێستاگه | ايستاده |
| بیٚ فەڕ | بی عُرضه |
| خراو | بَد |
| حەطیمەتەم[١٤٧] | نوكر شما هستم |
| ماڵەکەت بڕمه[١٤٨] | خانه‌ات خراب شود |
| بەصەدەقەت بوم | تصدقت گردم |
| قەضات له گیانم | دردت بجانم |
| منت بمرم | من بميرم |
| مەکه | نكن |
| بۆ چه وا ئەکەی؟ | چرا همچه ميكنيد؟ |
| من خۆ مردم | منكه هلاك شدم |
| بێژه پە[١٤٩] | بگو باو |

[١٤٥] بچینه نەچیر: بچینه ڕاو.

[١٤٦] بیکوژه: لێی بده.

[١٤٧] حەطیمەتەم : هەتیوەی تۆم، نۆکەری تۆم.

[١٤٨] ماڵەکەت بڕمه: ماڵەکەت بڕووخیٚ، کاولٚ بیٚ.

| | |
|---|---|
| وتت په؟[١٥٠] | گفتی باو؟ |
| چەی وت؟ | چەگفت؟ |
| **ل34** | |
| بێرانی[١٥١] | بیارش |
| بیده په[١٥٢] | بده باو |
| لەبسێنه[١٥٣] | از اوبگیر |
| لت سەن؟[١٥٤] | گرفتی از او؟ |
| دات په؟[١٥٥] | داد باو؟ |
| په بده[١٥٦] | بده باو |
| سەننی لت؟[١٥٧] | گرفت ازتو؟ |
| ئەزانم | میدانم |
| زانیم | دانستم |
| زانیت | دانستی |

---

(١٤٩) بێژه په: بێژه پێی، پێی بێژه، پێی بڵێ.

(١٥٠) وتت په: پێت وت؟

(١٥١) بێرانی: بیهێنه.

(١٥٢) بیده په: بیده پێی، پێی بده.

(١٥٣) لەبسێنه: لێی بسێنه.

(١٥٤) لت سەن: لێت سەن؟

(١٥٥) دات په: دات پێی؟، پێت دا؟

(١٥٦) په بده: پێی بده.

(١٥٧) سەننی لت: سەنی (سەندی) لێت؟

| | |
|---|---|
| زانی | دانست |
| ئاوات ئەخوازم | آرزو میکنم |
| ناوێسم | نمی ایستم |
| گەرەکم نییە | نمیخواهم |
| گەرەکتە | میخواهی |

**ل35**

| | |
|---|---|
| گەرەکی نییە | نمیخواهد |
| خۆەش هاتی | خوش آمدی |
| خوەشم گەرەکە | دوستش دارم |
| خۆت مەشارە | خودت راپنهان مکن |
| زووکە | زودباش |
| فرمانم هەس | کاردارم |
| نەتی برۆین؟[١٥٨] | نمیآیی برویم |
| بیٚ برۆین | بیا بویم |
| عەرضمان هەس[١٥٩] | عرض داریم |
| حە ئەیژی؟[١٦٠] | چه میگوئی؟ |
| چە ئەتوانی بکەی؟ | چه میتوانی بکنی؟ |

---

(١٥٨) نەتی برۆین: نایەیت برۆین؟

(١٥٩) عەرضمان هەس: قسەمان هەیە.

(١٦٠) حە ئەیژی: چی ئەڵێیت؟، ئەڵێیت چی؟

**چە ئەتوان بکا؟[١٦١] چە میتواند بکند؟**

**چەمان پە ئەکا؟[١٦٢] چکارمان میکنید؟**

**بێلاٚ بۆ خۆی هەر بژ[١٦٣] بگــذار برای خودش بگوید**

**هەر چیٚ لە دەستی تە بکا[١٦٤] هرچە زدستش میآید بکند**

**ل36**

**لە کەس ناترسم از کسی نمیترسم**

**من ئێژم بڕۆ من میگویم برو**

**بۆ چە ناڕۆیت؟ چرا نمیروی؟**

**بۆ چە بە قصەم ناکەی؟ چرا بحرفم نمیکنی؟**

**صەبرت بووت[١٦٥] صبر کنید**

**حەقیقەت لت ئەسنم[١٦٦] حقیقتا از تو خواهم گرفت**

**ئاگری گرت آگر گرفت**

**داین بگــذار**

**هەڵیگرە بردار**

**خواردی خورد**

---

[١٦١] چ ئەتوان بکا: چی ئەتوانیٚ بکا؟، ئەتوانیٚ چ بکا؟

[١٦٢] چەمان پە ئەگا: چیمان پێدەکات؟

[١٦٣] بێلاٚ بۆ خۆی هەر بژ: با هەر بۆ خۆی قسە بکات.

[١٦٤] هەر چیٚ لەدەستی تە بکا: هەر چی لەدەست دێت، با بیکات.

[١٦٥] صەبرت بووت: سەبرت هەبیٚ، ئارام بگرە.

[١٦٦] حەقیقەت لت ئەسنم: حەقیقەت لێت ئەسێنم.

| | |
|---|---|
| چاوت پە کەفت؟[١٦٧] | دیدی؟ |
| مەکەفە | نیفتی |
| کەفت | افتاد |
| خۆەشت گەرەکە؟دوستش داری؟ | |
| لە تەکیە[١٦٨] | همراهش است |
| ل37 | |
| سەننی[١٦٩] | گرفت |
| شکیا[١٧٠] | شکست |
| تم[١٧١] | میآیم |
| نەتم[١٧٢] | نمیایم |
| دڕیا[١٧٣] | پارەشد |
| خستی | انداخت |
| لەدەستم کەفت | از دستم افتاد |
| هەناردی | فرستاد |

(١٦٧) چاوت پە کەفت: چاوت پێی کەوت؟، بینیت؟.

(١٦٨) لە تەکیە: لە تەکیدایە، لەگەڵیدایە.

(١٦٩) سەننی: سەندی، لێی وەرگرت.

(١٧٠) شکیا: شکا.

(١٧١) تم: تێم.

(١٧٢) نەتم: نایەم.

(١٧٣) دڕیا: دڕا.

| | |
|---|---|
| هاوردی | آورد |
| هەنگاو هەڵگره | قدم بردار |
| ژانم کردکه | دلم درد میکند |
| شاه خۆی خاص[(١٧٤)] | شاه خودش خوب است |
| خودا عەمری درێژ بکا | خدا عمرش بدهد |
| تینگمه[(١٧٥)] | تشنه هستم |
| شاردی | پنهان کرد |
| ل38 | |
| ژنەفتم[(١٧٦)] | شنیدم |
| ژنەفتت؟[(١٧٧)] | شنیدی؟ |
| بینه ناوی[(١٧٨)] | بگـذار میانش |
| دەری بێرانه[(١٧٩)] | بیرون بیاور |
| کوڕه لاچۆ | پسر رو شو |
| مەکه لاچۆ | مکن رو شو |
| ماچم گەرەك بوو | بوسه خواستم |

---

(١٧٤) شاه خۆی خاص: شا خۆی خاسه(چاکه).

(١٧٥) تینگمه: تینوومه.

(١٧٦) ژنەفتم: بیستم.

(١٧٧) ژنەفتت: بیستت؟

(١٧٨) بینه ناوی: بیخه ناوی.

(١٧٩) دەری بێرانه: دەری بهێنه.

| | |
|---|---|
| ماچی پم نەدا[١٨٠] | بوسه بمن نداد |
| وتی لاچۆ وەقتی نییە | گفت رو شو موقع نیست |
| هات | آمد |
| نەهات | نیامد |
| چە بژم؟[١٨١] | چه بیگویم؟ |
| هیچ نازانم | هیچ نمیدانم |
| دو شەو خەوم پە نەکەفت[١٨٢] | دیشب خوابم نبرد |
| ئیمڕۆژ خاس خەفتم | امروز خوب خوابیدم |
| ل39 | |
| هاواری کرد | فریاد برآورد |
| قاوی کرد | صدا کرد |
| چەس؟[١٨٣] | چەخیراست؟ |
| چایی تێکە | چای بریز |
| بکە ناوی[١٨٤] | بریز میانش |
| بڕوانە | نگاه کن |

[١٨٠] ماچی پم نەدا: ماچی پێم نەدا.

[١٨١] چە بژم: چی بێژم؟، چی بڵێم؟

[١٨٢] دو شەو خەوم پە نەکەفت: دوێنی شەو خەوم لێ نەکەوت.

[١٨٣] چەس: چییە؟

[١٨٤] بکە ناوی: بیکەرە ناوی.

| | |
|---|---|
| بەر بکە ئەولاو[١٨٥] | آنطرف نگاه کن |
| بەری کردە لامەو[١٨٦] | نظر بسمت من نمود |
| تێمە لات[١٨٧] | میآیم پیش شما |
| برڕژنە | بریز |
| رژانی | ریخت |
| ئەیرڕژنی[١٨٨] | میریزی |
| بکە سەریا | بریز رویش |
| لایوە[١٨٩] | بردارش |
| **ل40** | |
| هەڵی مەگرە | برمدار |
| کەواو برژیاگە[١٩٠] | کباب پخته است |
| سوزیا[١٩١] | سوخت |
| برۆ بابرۆین | بیا برویم |
| ئەشیا وامان بکردیا[١٩٢] | باید چنین میکردیم |

[١٨٥] بەر بکە ئەولاو: روو لەولا بکە.

[١٨٦] بەری کردە لامەو: رووی لە من کرد.

[١٨٧] تێمە لات: دێم بۆ لات.

[١٨٨] ئەیرڕژنی: ئەیرڕێژێت.

[١٨٩] لایوە: لایبە.

[١٩٠] کەواو برژیاگە: کەبابەکە برژاوە.

[١٩١] سوزیا: سووتا.

| | |
|---|---|
| گەرەکم نەبوو | نمیخواستم |
| من ئەڕۆم | من میروم |
| هەر چە خۆت ئەزانی بکە | هرچە خودت میدانی بکن |
| دیارە | معلوم است، پیداست |
| لەم سەفەرە بێمەو | از این سفر بیایم |
| خەلاَتت ئەکەم | خلعت بشما میدهم |
| پیاگ ئەوەس هەرچە | مرد آنست جمیع |
| عیلمە بیزانێ | علوم را بداند |
| ئەمە چەننێ قورسە ! | این چقدر سنگین است |
| زکم تلّیشیا | شکمم ترکید، بادکرد |
| کوت بوو[١٩٣] | نصف شد |
| ل41 | |
| ئیتر بەسە | دیگر بس است |
| ئەکەی | میکنی |
| ناکەی | نمیکنی |
| ژنەکە چاو رەشە | زنکە چشم سیاه است |
| لەگەلّیا رویم | باو رفتم |

---

[١٩٢] ئەشیا وامان بکردیا: دەبوو وا بکەین.

[١٩٣] کووت بوو: لەت بوو.

| | |
|---|---|
| له تەکیا نارۆم | همراش نمیروم |
| بێلانم[١٩٤] | بگــذارم |
| هەر جێگێکه | هر کجاست |
| هەر ماڵێك | هر خانەاست |
| تۆ لەناویا بووی | تو در انجا باشی[*] |
| دڵم ها لێنه[١٩٥] | دلم انجاست |
| تۆ نەوی ئەمرم | تو نباشی فانی میشوم |
| چه بکەم؟ | چکنم؟ |
| چارم نییه | چارەندارم |
| ئەچم بۆ کێف[١٩٦] | بکوه میروم |
| ل42 | |
| ئەڕۆم بۆ دەشت | سر بصحرا افکنم |
| شێت ئەوم | دیوانه خواهم شد |
| خوونم ها له ملتا[١٩٧] | خونم گردن تست |
| خۆت پێم بگەیەنه[١٩٨] | خودت را بمن برسان |

---

(١٩٤) بێلانم: بمهێڵه.

(*) ئەگەر بەگوێرەی بەرامبەر مانای کوردی: (تۆ لەناویا بووی) بێت، دەبێ فارسییەکەی ببێته (تو درانجا بودی).

(١٩٥) دڵم ها لێنه: دڵم لەوێیه.

(١٩٦) ئەچم بۆ کێف: ئەچم بۆ کێو.

(١٩٧) خوونم ها له ملتا: خوێنم له ملتایه، خوێنم له ئەستۆته.

| | |
|---|---|
| هەر چە تۆ یەشێت | هرجای تو درد کند |
| کە چاوەکانم[١٩٩] | بچشم من باشد |
| وتم و رۆیم | گفتم و رفتم |
| تۆ بیزان و خودا[٢٠٠] | تو دانی و خداوند |
| بەوت ئەسپێرم | باو می سپارمت |
| هەرچە ئەکەی بکە | هرچە میکنی بکن |
| دڵت لە کوچکە[٢٠١] | دلت سنگ است |
| وا بزانم کە ئاسینە[٢٠٢] | گویا از آهن است |
| دەنکە[٢٠٣] | هی بر مرکب کن |
| بۆ چە ڕێگە نادەیت؟[٢٠٤] | چرا راه نمیآید؟ |
| جێت تێڵم؟[٢٠٥] | جایت میگــذارم |
| درەنگە | دیراست |

(١٩٨) خۆت پێم بگەیەنە: خۆتم پیێ بگەیەنە، بمگەرێ.

(١٩٩) هەر چە تۆ یەشێت، کە چاوەکانم: هەر کوێت ئازاری هەیە لە چاوی منی بکە.

(٢٠٠) تۆ بیزان و خودا: هەر خوا و تۆ دەیزانن.

(٢٠١) دڵت لە کوچکە: دڵت لە بەردە.

(٢٠٢) وا بزانم کە ئاسینە: وا بزانم لە ئاسن بێت.

(٢٠٣) دەنکە: دەنگ بکە (بۆ سواربوونی وڵاخ).

(٢٠٤) بۆ چە ڕێگە نادەیت: بۆچی ڕێگا نادەیت.

(٢٠٥) جێت تێڵم: جێت دەهێڵم.

**ل43**

| | |
|---|---|
| ناگەیەین بڕۆ | نیمرسم بمنزل |
| کوڕە گەوجی | پسر دیوانه |
| تەهەڵدە[٢٠٦] | بیرونش کن |
| بۆچە دەعواتان کرد؟[٢٠٧] | چرا چنگ کردید؟ |
| چێوتان گەرەکە[٢٠٨] | چوپ میخواهید |
| لەمەودوا خاس بن[٢٠٩] | بعد از این خوب حرکت کنید |
| بەسی قسە بکەن[٢١٠] | کم حرف بزنید |
| عەقڵ لە گەچتێ خاس ترە[٢١١] | عقل از همه چیز بهتراست |

---

[٢٠٦] تە هەڵدە: تێی هەڵدە.

[٢٠٧] بۆ چە دەعواتان کرد: بۆچی شەڕتان کرد؟

[٢٠٨] چێوتان گەرەکە: چێو: بە مانای (دار). واتە: دارتان دەوێ (بۆ لێدان) (دارکاریی).

[٢٠٩] لەمەودوا خاس بن: لەمەودوا چاك بن.

[٢١٠] بەسی قسە بکەن: بەس قسە بکەن.

[٢١١] عەقڵ لە گەچتێ خاس ترە: عەقڵ لەگشت شتێ چاکترە.

## چەند لاپەڕەیەکی نموونەی فەرهەنگە دەستنووسەکە

هذا کتاب — بسم الله الرحمن الرحیم — لغات کردی

هو

بهترین ثنائی که قدوسیان ملأ اعلی و مقربان بارگاه
به زبان فصاحت مشحون و بیان بلاغت مضمون بآن
متکلم گردند حمد حضرت واجب الوجودیست که ابداع
نعمتهای ظاهره و باطنه بندهائی خود را مستغرق گردانید
و باعظم نعم که از رسال محمد مصطفی و ائمه هدی علیه
سلام الله علیهم این امت مرحومه را اختصاص داده سرافراز
ساخت و بهترین ذکری که ملائکه مقربین و عباد مخلصین
بآن مشغول باشند درود بر سید المرسلین و ائمه
طاهرین صلوات الله و سلامه علیهم اجمعین است
اما بعد برای خداوندان عقل و ذکا اینعنی ظاهر و هویداست
زبان کردی که از السنه فصیحه بزرگ است تا حال بطوریکه
باید نوشته نشده بود و لازم بود که این زبان را بسهل ترین طریق
و برای اشخاص که خواهند آنرا بیاموزند نوشته شود لهذا احقر الامرائین
بنده درگاه بطور اختصار به تألیف این کتاب پرداخت در سنه ۱۳۰۳

| | |
|---|---|
| ئاگرهان | آتش زدن |
| بزنێ کردن | بیار کردن بیل کردن |
| بیگار کردن | خسکی کردن |
| بوون | بودن |
| بڕین | بریدن |
| بەرگرهان | جلوگیری کردن |
| بگرین | گذشتن |
| بەرزکردن | بلند کردن |
| بەرکردن | پوشیدن |
| بارین | باریدن |
| بیرکردن | فکر کردن |
| بەرەوپیری دوین | استقبال رفتن |
| برسی بون | گرسنه شدن |
| پێکان | نشانه زدن |
| بەرەڵابون | رها شدن |

(ە)

| | |
|---|---|
| هَلپَڕین | جستن |
| هَل‌هاوردن | حل متاکردن |
| هڕگین بون | گلی شدن |
| هَلمت دان | حمله کردن |
| خواردن | خوردن |
| خستن | انداختن |
| خَفتن | خوابیدن |
| خوزان | خاریدن |
| دڕین | پاره کردن |
| دَرهاوردن | بیرون آوردن |
| داوَزین | پیاده شدن |
| دُزین | پیدا کردن |
| دُژِن دان | فحش دادن |
| دُروتن | دروغ گفتن |
| دِزین | دزدیدن |

| | |
|---|---|
| تاوڤان | دوانیدن |
| تێربون | سیر شدن |
| ترسان | ترسیدن |
| تاشین | تراشیدن |
| جوانن | حرکت دادن |
| چنچکان دانیشتن | چمباتمه نشستن |
| چون | رفتن |
| چنین | چیدن |
| چقانن | فروکردن |
| چڕانن | صدا کردن |
| چمانن | خم کردن |
| حلگرتن | برداشتن |
| حلسان | برخاستن |
| حرّاکردن | دویدن |
| حناسه کیشان | آه و خمیازه کشیدن |

| | |
|---|---|
| نوژکردن | نمازکردن |
| بچهرچون | شکارکردن |
| وتن | گفتن |
| وک یک بون | مساوی بودن |
| وستان | ایستادن |
| هاتن | آمدن |
| هژاربون | فقیرشدن |
| ناردن | فرستادن |
| شکانن | شکستن |

افعالیکه از روی قاعده صرف میشوند
اینها هستند هرگاه بخواهند نفی ونهی
وجحد بنا نمایند یک (نا) اضافه
میشود بطریقیکه ذکر خواهد شد

دانشتن نشستن

من داانشم تو داانشی اود اانشت ام داانشین

من می نشینم تو می نشینی او می نشیند ما می نشینیم

اودا انشن اوان دا انشن - من دا نشتم تود انشتی

شما می نشینید ایشان می نشینند من نشستم تو نشستی

اود انشت ام دانشتین اودانشتین اوان دانشتن

او نشست ما نشستیم شما نشستید ایشان نشستند

من دانشتکم تو دانشتکی او دانشتک ام دانشتکین

من نشسته ام تو نشسته او نشسته است ما نشسته ایم

اود انشتکن اوان دانشتکن من دانشم تو دانشی

شما نشسته اید ایشان نشسته اند من بنشینم تو بنشینی

اودانشت ام دانشین اودانشن اوان دانشن

او بنشیند ما بنشینیم شما بنشینید ایشان بنشینند

دانش دانشن

بنشین بنشینید

کِلان                                                    کاشتن

مِن اکِلِم    تو اکِلی    اَو اکِلِ    اِم اکِلِین

من میکارم    تو میکاری    او میکارد    ما میکاریم

اَوِ آکِلِین    اَوِان آکِلِین    مِن کِہلام    تو کِہلات

شما میکارید    ایشان میکارند    من کاشتم    تو کاشتی

اَدِ کِہلای    اِم کِہلامان    اَدِ کِہلاثان    اَوِان کِہلایان

او کاشت    ما کاشتیم    شما کاشتید    ایشان کاشتند

مِن اُبکِلِم    تو اُبکِلی    اَوِ ابکِلی    اَم ابکِلِین

من خواهم کاشت    تو خواهی کاشت    او خواهد کاشت    ما خواهیم کاشت

اَوِ ابکِلِین    اَوان ابکِلِین    مِن کِہلاگِم    تو کِہلاگتَ

شما خواهید کاشت    ایشان خواهند کاشت    من کاشته ام    تو کاشته

اَدِ کِہلاگی    اِم کِہلاگمانَ    اَدِ کِہلاگاتَ    اَوان کِہلاگیان

او کاشته است    ما کاشته ایم    شما کاشته اید    ایشان کاشته اند

بِکِہلہ    بِکِہلِن

بکار    بکارید

دیبشتہ

(۱۳)

دانِشتن — نشستن

## فصل جحد

مِن دانا نِشم — تو دانا نِشی

من نخواهم نشست — تو نخواهی نشست

اُو دانا نِشتِ — اَم دانا نِشِن

او نخواهد نشست — ما نخواهیم نشست

اِو دانا نِشن — اِوان دانا نِشن

شما نخواهید نشست — ایشان نخواهند نشیت

مَنِهِش — مَنِهِشِن

مَشین — مَشینید

مِن نا بِکلم — تو نا بِکلی — اُو نا بِکلت — اَم نا بِکلن

من نخواهم کاشت — تو نخواهی کاشت — او نخواهد کاشت — ما نخواهیم کاشت

اِو نا بِکلِن — اِوان نا بِکلِن

شما نخواهید کاشت — ایشان نخواهند کاشت

مَکِیله — مَکِلِن

مکار — مکارید

(۱۰)

## افعالیکه صرف نمیشود

| | | | |
|---|---|---|---|
| بارِن | باریکَ | آوارو | باری |
| باریدن | باریده است | میبارد | بارید |
| وچپان | اُرچه | رِچپا | وچپاک |
| منجمد شدن | منجمد شود | منجمد شد | منجمد شده است |
| گہن | گہے | گہکَ | اگِی |
| رسیدن میوه | رسید | رسیده | خواهد رسید |
| کاوژ کردن | کاوبژ اکا | | |
| نشخار کردن | نشخار میکند | | |
| فرّین | اَفِرَ | فرّی | فرّیک |
| پریدن | خواهد پرید | پرید | پریده است |
| لوّرین | لوّری | الوّرِ | لوّریک |
| چریدن | چرید | بچرد | چریده |
| لقّه خستن | لقّہ اخا | لقی خست | لقی خستک |
| گد انداختن | گد میاندازد | گد انداخت | گد انداخته است |

(۱۴)

## افعالیکه از روی قاعده صرف نمیشود

وُتِن — گفتن.

| | | |
|---|---|---|
| مِن اَبڑم | تو اَبڑی | اَو اَبڑت |
| من میگویم | تو میگویی | او میگوید |
| اَم اَبڑین | اِو اَبڑن | اَوان اَبڑن |
| ما میگوییم | شما میگوئید | ایشان میگویند |
| مِن وُتِم | تو وُتِت | اَو وُتِی |
| من گفتم | تو گفتی | او گفت |
| اَم وُتِمان | اِو وُتِتان | اَوان وُتِہان |
| ما گفتیم | شما گفتید | ایشان گفتند |
| مِن وُتِگم | تو وُتِگت | او وُتِگی |
| من گفته ام | تو گفته ای | او گفته است |
| اَم وُتِگمان | اِو وُتِگتان | اَوان وُتِگیان |
| ما گفته ایم | شما گفته اید | ایشان گفته اند |

بِڑ — بگو

بڑین — بگوئید

| | |
|---|---|
| اردم بودشت | سر بصحرا افکنم |
| شت اوم | دیوانه خواهم شد |
| خونم ها لیلتا | خونم گردن تست |
| خوت بم بگینه | خودت را بمن برسان |
| مرچه تو نشت کچاو کانم | هر جای تو درد کند بچشم من باشد |
| دتم ردهم | گفتم و رفتم |
| تو یزان وخدا | تو دانی و خداوند |
| بونت اسپرم | مادمی سپارمت |
| هرچاکی بکر | هرچه میکنی بکن |
| دلت له کچکنه | دلت سنگ است |
| وابزانم که آسین | گویا از آهن است |
| دنکر | هی بر مرکب کن |
| بوچه دکه نایت | چرا راه نمی آئید |
| جیت نلم | جایت نمیگذارم |
| دیرنک | دیر است |

..۲:

| | |
|---|---|
| ناگیەتن بەرو | نمیرسیم منزل |
| کرەگوێچی | پسر دیوانه |
| تە مَلّدَ | بیرونش کن |
| بوچە دعواتان کرد | چرا جنگ کردید |
| چوتان گرکە | چوب بیندازید |
| لەمە دوا خاس بن | بعد از این خوب حرکت کنید |
| بی قصە بکن | کم حرف بزنید |
| عقل لە گرچتە خاس ترە | عقل از همه چیز بهتر است |

۱۳۲۳

هو القادر المتعال

حسب الامر سرکار بندگان اعلیحضرت قدر قدر
همیون السلطان الاعظم والخاقان الاکرم
ناصر الدین شاه قاجار خلد الله ملکه و دولته
بسعی و اهتمام اقل خانه زادان ابوالحسن منشی
اردلان کردستان

## ملخص البحث

# قاموس كردي رصين كتب قبل ١٢٢ سنة

محمد حمه‌باقي

## المقدمة

### هذا القاموس

في عام ١٩٨٩م في المكتبة القومية بطهران، وقع بين يديَ هذا القاموس. واخذت قصاص ورق ودونت عليه رقم ايداع القاموس في المكتبة المذكورة، املا في ان اطلع عليه حين ان يأتي دوره.

وقد اتضح لي انه خلال الـ(١٧) عام الماضية من الهجرة والتهجير، وكما هو حال عشرات بل مئات من قصاصات الورق المبعثرة لديَ، لم يبق لتلك القصاصة التي دونت عليها رقم ايداع القاموس أي اثر يذكر. الا انه لحسن الحظ لازلت احتفظ بنسخة من هذا القاموس. وبدا لي انه حان الوقت لانكب على دراسته وتفصيله.

**تعريف القاموس:**

١ـ كتب هذا القاموس السيد (ابو المحسن) البيشخزمتي في اردلان كردستان (مدينة سنه) عام ١٣٠٣ هجرية، ١٨٨٥ ميلادية.

٢ـ القاموس يتألف من (٤٣) صفحة من الحجم المتوسط بمقاسات (٢١×١٥سم). وتضم كل صفحة (١٥) سطرا.

٣ـ القاموس هو قاموس كردي ـ فارسى (باللهجة الاردلانية)، اذ ادرجت فيه المصطلحات الكردية وما يقابلها معنى بالمصطلحات الفارسية.

٤ـ نُظم القاموس في الصفحات العشر الاولى منه وفق النظام الابجدي.

٥ـ استخدم الكاتب نوعين من الخط وذلك ليسهل اطلاع القاريء عليه، وليبين لنا ان هناك لغتين مختلفتين. وبالشكل التالي:

أ ـ كتب المصطلحات الكردية بخط (النسخ).

ب ـ كتب المصطلحات الفارسية بالخط (الفارسي).

ومن الجدير بالذكر ان الكاتب قد عمد الى استخدام نوعين من الخط ليبين لنا بان هناك اختلافا جوهريا بين اللغتين وان كلا منهما مستقلة عن الاخرى.

٦ـ القاموس يضم (٥٣١) مصطلحاً. وقد عالج (٣١) منها من المصطلحات من الناحية القواعدية.

٧ـ ومن المؤسف ان الصفحتان الاوليان من القاموس قد فقدتا وهما تضمان حرف (أ) اذ يبدأ من الصفحة (٣).

٨ـ لم يطبع القاموس لحد الآن.

٩ـ ألّف القاموس بطلب من الملك ناصرالدين القاجاري (١٨٤٨ـ١٨٩٦).

*Abstract*

# A significant Kurdish Dictionary Compiled 122 years ago

**Muhemmed Hama Baqi**

Preface:

In 1989 I visited the National liberary in Tahran where I found this dictionary, so I took a sheet of paper and put down its number looking forward to looking into it afterwards.

After "17" years of emigration and deportation, I lost that sheet, but I think myself lucky that I had a copy of it. So the time has come to apply myself eagerly to studying it.

Specifications

1/ It was compiled by Mr. (AbulMuhsin) Alpeshchizmati (Ardalan-Kurdistan) [Sina] in 1885.

2/ The dictionary consists of "43" medium pages (21×15cm.) with "15" lines.

3/ It is a Kurdish-Persian dictionary (Ardalan dialect). The Kurdish terms are defined in Persian.

4/ The first ten pages of the dictionary are alphabetically arranged.

5/ The Kurdish terms are written in (Nasich) inscription and the Persian terms in Persian inscription. The compiler did that deliberately to confirm independency of Kurdish language.

6/ The dictionary includes "531" terms, "31" of which are grammatically explained.

7/ Unfortunately two pages have been lost, so the dictionary begins with page "3".

8/ The dictionary has not been printed yet.

9/ The dictionary was compiled due to King Nasir-alddin Qajari instructions (1848-1896).

# پۆلینکردنی تەرزسازییانەی زمانی کوردی (کرمانجی خواروو) لە زمانەوانی بەراوردکاریدا

د. شێرکۆ بابان
پرۆفیسۆری هاریکار

لە ئەو لقەی زمانەوانیدا کە بە زمانەوانی بەراوردکارییانە ( Comparative Linguistics) ناسراوە، بە دوو ڕێگادا بەراورد ئەنجام دراوە. لە ڕێگای یەکەمدا، پەیوەندی مێژوویی و خزمایەتی نێوان زمانەکان خراوەتە بەر مەبەست. لە ڕێگای دووەمدا، بایەخ نەدراوە بە مێژووی زمان و خزمایەتی ئەو زمانە لەگەڵ هی تردا، بەڵکو بایەخ دراوە بە ئەو لێکچوونانەی کە لە ئاستی ڕستەسازی و وشەسازیدا هەیە. ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە، بە پۆلینکردنی تەرزسازییانە ناسراوە ( Typological Classification). بێگومان ئەم جۆرە پۆلینکردنە، کەڵکێکی زۆر دەبەخشێت بە بزاڤی لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردیدا، بە ئەم چەشنە:

**یەکەم**: بەهۆی ئەم جۆرە بەراوردەوە، خەسڵەتە زانستییەکانی تەرزی زمانەکە دیار دەکرێت و هێڵە پانەکانی ڕێزمانی کوردی دەخرێتە ڕوو.

**دووەم**: پێگەی زمانی کوردی دیاری دەکرێت بە بەراورد لەگەڵ زمانی گەلانی سەر زەویدا، ئەم جۆرە پێگەیە دەری دەخات کە زمانەکەمان تەرزە زمانێکی سروشتییە و سیمای سەربەخۆیی خۆی هەیە، وەك زمانی گشت میللەتان.

**سێیەم**: جۆرە لێکۆڵینەوەی ئاوها، بریتییە لە هەنگاوێکی دەستپێکی بۆ شرۆڤە کردنی زمانی کوردی. بۆ نموونە، ئەگەر زانرا زمانەکەمان لە تەرزی بکەر بەزێنە (پرۆ

درۆپ)، ئـەوا لـە یەکـەم هـەنگاوەوە ڕێگـای لێکۆڵینـەوە ڕوون دەبێتـەوە و چـرایەك هەڵدەبێت لەنێو بـیری تـۆژەردا، چـی بـە بـەراورد لەگـەڵ زمانـانی هـەمان تـەرزدا، چـی بـەجیاوازی لەگـەڵ زمانـانی تـەرزەکانی تـردا. بـۆ نموونـە، زمـانی ئینگلیـزی و زمـانی فەرەنسی لە جۆری (پرۆ درۆپ)نین و هەر لە سەرەتاوە، تێ دەگەین کە خـاڵی جیـاوازی لە کوێدایە. ئەم دیاردەیە لە کۆپلەکانی پاشتردا ڕوون دەکرێتەوە.

**__چوارەم__**: جۆرە پۆلینکردنی ئاوها، بنـەما زانـستییەکانی بزاڤـی (وەرگێـڕان) دیـاری دەکات. بۆ نموونە، ئەگەر زمانی کوردی لە چەشـنی ڕیـز بەنـدی (بکـەر ـ بـەرکار ـ کـار) بێت، ئەوا زۆر بە ئاسانتر وەردەگێڕدرێت بۆ زمانێکی تر کە هەمان ڕیز بەندی هەبێت. بە هەمان شێوە، بزاڤی وەرگێڕان دژوارتر دەبێت ئەگەر بە زمانێکی تر بـەراورد بکرێـت کـە هەمان ڕیز بەندی نەبێت. بۆ نموونە، ڕیز بەندی زمانی عەرەبی بریتییە لە (کـار ـ بکـەر ـ بـەرکار) و ڕیـز بەنـدی زمـانی ئینگلیـزی بریتییـە لـە (بکـەر ـ کـار ـ بـەرکار). لـە جـۆرە هەڵوێستی ئاوهادا، بزاڤی وەرگێـڕان زۆر بـە گرانـی دەگـەڕێت. بـە واتایـەکی تـر، بزاڤـی وەرگێڕان زۆر بە ئاسانی دەگەڕێت لەنێوان زمانە هاوتەرزەکاندا.

**__پێنجەم__:** ئەم پۆلینکردنە، هەندێك بیر و بۆچوونی بێ بنەما هەڵدەوەشێنێتەوە، کـە زمانی کوردی بە کـەم بزانرێـت، لـە چـاو ئـەو زمانانـەدا کـە بـە زۆرەملـێ بەسـەر کـوردا دەسەپێنرێن.

**__شەشەم__:** لە کۆتایی ئەم نووسـینەدا، دەتـوانین پێناسـەیەکی زانـستی بـۆ زمانەکـە بنووسین و بە ئەو پێناسەیە، زمانەکەمان بناسـێنین بـە زانایـانی زمانـەوانی. نـاوەرۆکی ئەو پێناسەیە لە دووتوێی ئەم نووسینەدا ڕوون دەبێتەوە.

سەرەڕای ئەوەی گوترا، دەشێت هەندێك خەسڵەتی تـری زمانەکـەمان بخەینـە ڕوو، کە هێشتا دەرخواردی بزاڤی زمانەوانی بەراوردکاری نەدراوە.

## ١ـ پۆلینکردنی بەپێی ڕیزبەندی وشە (Word Order)

زمانانی گەلانی سەر زەوی، بەپێی ڕیزبەندی وشەکانی ڕستە پۆلین کراون. لە ئەو ڕیزبەندەدا، سێ وشەی سەرەکی لە ڕستەدا بە هەند وەرگیراون، کە بریتین لە (بکەر) بە هێمای (S)، لە (بەرکار) بە هێمای (O) و لە کار بە هێمای (V). بە واتایەکی تر، ڕیزبەند (بکەر، بەرکار، کار) وەك پێوەرێك بەکارهێنراوە بۆ بەراورد کردنی زمانەکان لەنێوان خۆیاندا. ئێستاش ئەگەر هەر سێ هێماکەی سەرەوە لە یەکتری بدەین، دەبینین کە شەش ڕیزبەند پێك دەهێنین، خشتەی (١):

| ڕیزبەند | ڕیزبەند بە هێما |
| --- | --- |
| (بکەر : بەرکار : کار) | SOV |
| (بکەر : کار : بەرکار) | SVO |
| (کار : بکەر : بەرکار) | VSO |
| (کار : بەرکار : بکەر) | VOS |
| (بەرکار : کار : بکەر) | OVS |
| (بەرکار : بکەر : کار) | OSV |

**خشتەی (١): پۆلینکردنی زمانان بەپێی ڕیزبەندی وشە**

ئێمە لەو باوەڕەداین کە ڕیزبەندی کاری تێنەپەڕیش کەڵکی خۆی هەبێت و دەشێت لە ڕۆژێکدا بەکاربهێنرێت. سەبارەت بە زمانی کوردی، دەشێت هەردوو ڕیزبەندەکە بخەینە ڕوو، وەك (SV/SOV). واتە، ئەم زمانەی ئێمە لە کاری (تێنەپەڕ)دا ڕیزبەندی (بکەر، پاشان، کار)ی هەیە و لە کاری تێپەڕ ڕیزبەندی (بکەر، بەرکار، کار)ی هەیە، وەك:

ـ کاری تێنەپەڕ (SV)، وەك:

| بکەر | کار |
| --- | --- |
| شیلان | خەوت |

ـ کاری بکەر نادیار (تێپەڕ)، (SV) وەك:

| جێگری بکەر | کار |
|---|---|
| شیلان | نووسراوە |

ـ کاری (تێپەڕ)، (SOV):

| بکەر | بەرکار | کار |
|---|---|---|
| شیلان | نانی | خواردبوو |

ـ کاری (ئاندن)، تێپەڕ (SOV):

| بکەر | بەرکار | کار |
|---|---|---|
| شیلان | نامەکەی | سووتاندبوو |

کەواتــە، قــاڵبی ســۆڤ (SOV) و قــاڵبی ســڤ (SV)، هــەموو کــاری زمانەکــە دادەپۆشن. ئەوەش لە یاد نەکەین کە قاڵبی (SV) بریتییە لە قـاڵبی (SOV) لـەپاش فرێدانی هێمای بەرکار (O)، کە پێویست نییە بۆ کاری (تێنەپەڕ).

سەبارەت بە پانتـایی رووبـەری بـەکارهێنانی ئـەو ریزبەندانـە لـە زمانـانی جیهانـدا، دەبینین کە جیاوازییەکی زۆر هەیە. بۆ نموونـە، ئـەو قاڵبانـەی کـە بـە (بکـەر)، یـان بـە هێمای (S) دەست پێ دەکەن، زۆر بەرفراوان و گشتین، بەتایبەتی قـاڵبی (SOV) کـە لە هـەموو جۆرەکـانی تـر، بـەرفراوانترە و لـە هـەموویان پـتر بڕشـتی هەیـە لـە زمانـانی بەندەی سەر زەویدا. ئەو ڕاسـتییەش بـە بـیر دەخەینـەوە کـە زمانەکـەی ئێمـە لـە ئـەم جۆرەیە. ئێستاش، دەتوانین خشتەیەك پێشکەش بکەین دەربارەی مەودای بەربڵاوی لە بەکارهێنانی ئەو ریزبەندانەدا، خشتەی (٢):

| سەرەتا بە... | هێما | پانتایی بەکارهێنان |
| --- | --- | --- |
| بکەر<br>( بکەر ـ لەپێش) | SOV | زۆر زۆر بەربڵاوە لە بەکارهێناندا |
| | SVO | |
| کار<br>(کار ـ لەپێش) | VSO | زۆر کەمتر بەکارهێنراوە، بە بەراورد بە جۆرەکەی سەرەوە. |
| | VOS | |
| بەرکار<br>(بەرکار ـ لەپێش) | OVS | ئەم جۆرە ریزبەندە زۆر زۆر دەگمەنە، بەتایبەتی (OSV) هێشتا نموونەیەکی پتەوی نییە. |
| | OSV | |

خشتەی (٢): پانتایی ریزبەندەکان لە بەکارهێناندا

سەبارەت بە ئەو زمانانەی کە ئێمە لێیان ئاشناین، دەتوانین ریزبەندەکانیان بخەینە ڕوو، وەك:

- زمانی ئینگلیزی و زمانی فرەنسی، ریزبەندی (SVO).
- زمانی تورکی و فارسی، ریزبەندی (SOV).
- زمانی عەرەبی، ریزبەندی (VSO).

لە ڕاستیدا، ئەم جۆرە بەراوردە ئەنجامێکی کاریگەر دەدات بە دەستەوە، بەڵام کێشەش هەر دەمێنێت، چونکە هەندێك لە زمانەکان بە جوانی پێوانە ناکرێن و لە هەندێك جۆرە رستەدا، ریزبەندێکی تر پیشان دەدەن. یان هەندێك زمانی تر دوو (بکەر) هەڵدەگرن و دەشێت (بکەر)ی یەکەم لابرێت لە ڕستەکە. بۆ نموونە، لە کوردیدا دەشێت بکەری (شیلان) لاببەین، وەك:

| | بکەر | بەرکار | کار |
| --- | --- | --- | --- |
| بکەر پارێزی | شیلان | نامەکەی | ناردووە |
| بکەر بەزێنی | .... | نامەکەی | ناردووە |

له ئـەم بـارەدا، قـاڵبی (SOV) دەگۆڕێـت بـە (OV-). کەواتـە، هـەر کاتێـك کـە ویستمان قاڵبی زمانی کوردی بدۆزینەوە، دەبێت بکەری (جودا)، واتە بکەری دەربڕاو بە (ناو)، یان بە (جێناوی جودا) ئامادە بکەین. لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێك زمانی تر هەیە کە مۆرفیمەکانیان لە بنیادی وشەدا توانەتەوە و ئـەو زمانانـە لـە ئاسـتی ڕیزبەنـدی وشـەدا تەمومژ پیشان دەدەن.

## ٢ـ زمانێکی پرۆدرۆپ (بکەر بەزێن: Pro-drop):

یەکێك لە ئاکارەکانی زمانی کوردی ئەوەیە کە (بکەر) کاری ڕستەکەی خۆی نیشان دەکات و دەی نەخشێنێت بە (جێناوی لکاو)، وەك:

**(من) نان دەخۆ (م)**

**(ئێمە) نان دەخۆ (ین)**

کەواتە، بکەری ڕستە نوێنەری خۆی هەیە لە بنیادی (کـار)دا. بـۆ نموونـە، هـەردوو جێناوی لکاو (م) و (ین) بریتین لە نوێنەری هەردوو جێناوی (مـن) و (ئێمـە) لـە بنیـادی کاری (دەخۆ)دا. کەواتە، دەتوانین بڵێین لە زمانی کوردیدا (بکەر)ی ڕستە دووجـار و لـە دوو جێ بۆی هەیە ئامادە بێت لە ڕستەکەی خۆیدا، جارێـك بـە (نـاو) یـان بـە (جێنـاوی جودا) و جارێکی تر بە (جێناوی لکاو)، بەڵام بە دوو رەفتاری جیاوازەوە، وەك:

**یەکەم**: بکەری جودا، واتە بکەری دەربڕاو بە (ناو) یان بە (جێناوی جودا) شلایەتی پیشان دەدات و دەشێت لابـبردرێت، وەك:

**(من) نان دەخۆ(م) : (ـــ) نان دەخۆ(م)**

**(ئێمە) نان دەخۆ(ین) : (ـــ) نان دەخۆ(ین)**

**دووەم**: بکەری لکاو، واتە بکەری دەربـڕاو بـە (جێنـاوی لکـاو)، پتەوایـەتی پیـشان دەدات و بـەهیچ جۆرێـك ناشـێت لابـبردرێـت و لابردنـی دەبێـت بـەهۆی هـەرەس هێنـانی ڕستەکە.

کەواتـە، ئـەو دوو جـۆرەی (بکـەر) بـە کـەس و بـە ژمـارەی کـەس ڕێـك دەکـەون و دەشێت ئەو یەکەیان کـە وەك (نیـشان)ێك بنیـادی کارەکـە دەنەخـشێنێت، بـە پتـەوی بمێنێتەوە و ببێت بە (بەردی بناغە)ی ڕسـتەکە. بەرانبـەر بـە ئـەوە، بکـەری سـەرەتای

ڕستەکە بۆی هەیە لابچێت، چونکە (هەبوون) و (نەبوون)ی هیچ ناگۆڕێت لە ئەو جێناوە لکاوەی کە بووە بە نوێنەری لە بنیادی کارەکەدا و کلکی کارەکەی پێ نیشان کراوە. ئەم دیاردەیەش خۆی لە خۆیدا پێی دەگوترێت (pro-dropy) بە واتای (بکەر بەزێنی)، چونکە ڕستەکە بکەری راستەقینەی خۆی دەبەزێنێت و قنیات دەکات بە ئەو نیشانەیەی کە بنیادی کارەکەی نەخشاندووە. لە ڕاستیدا، لە کرمانجی خوارووی، دیاردەی (بکەر بەزێنی) هێندە بەربڵاوە، هەموو کەلێن و قوژبنێک دەگرێتەوە، چونکە نیشانەی (جێناوی لکاو)ی (بکەر) بریتییە لە نەگۆڕێکی (رەها) و بە ڕەهایی لە بنیادی کاردا فەرمانڕەوایی دەکات. هەر لەبەر ئەوە، لە زۆربەی زۆری رووبەرەکانی ڕێزماندا دیاردەی (بکەر بەزێنی) بە وردی دەچەسپێت، وەک:

<u>یەکەم: دەمکاتی رانەبردوو:</u>

**<u>ـ کاری تێنەپەڕ، وەک:</u>**

**(من) دەڕۆم : ( ـ ) دەڕۆم**

**(تۆ) دەڕۆیت : ( ـ ) دەڕۆیت**

**(ئەو) دەڕوات : ( ـ ) دەڕوات**

**(ئێمە) دەڕۆین : ( ـ ) دەڕۆین**

**(ئێوە) دەڕۆن : ( ـ ) دەڕۆن**

**(ئەوان) دەڕۆن : ( ـ ) دەڕۆن**

**<u>ـ کاری تێپەڕ، وەک:</u>**

**(من) دەنووسم : ( ـ ) دەنووسم**

**(تۆ) دەنووسیت : ( ـ ) دەنووسیت**

**(ئەو) دەنووسێت : ( ـ ) دەنووسێت**

**(ئێمە) دەنووسین : ( ـ ) دەنووسین**

**(ئێوە) دەنووسن : ( ـ ) دەنووسن**

**(ئەوان) دەنووسن : ( ـ ) دەنووسن**

دووەم: فەرمانی راستەوخۆ:

**ـ کاری تێنەپەڕ، وەك:**

**(تۆ) بخەوە : ( ـ ) بخەوە**

**(ئێوە) مەخەون : ( ـ ) مەخەون**

**ـ کاری تێپەڕ، وەك:**

**(تۆ) نامە بنێرە : ( ـ ) نامە بنێرە**

**(ئێوە) نامە بنێرن : ( ـ ) نامە بنێرن**

سێیەم: دەمکاتی رابردوو، وەك:

**(من) رۆیشتم : ( ـ ) رۆیشتم**

**(تۆ) رۆیشتیت : ( ـ ) رۆیشتیت**

**(ئەو) رۆیشت : ( ـ ) رۆیشت**

**(ئێمە) رۆیشتین : ( ـ ) رۆیشتین**

**(ئێوە) رۆیشتن : ( ـ ) رۆیشتن**

**(ئەوان) رۆیشتن : ( ـ ) رۆیشتن**

**ـ کاری تێپەڕ، وەك:**

**(من) نووسیم : ( ـ ) نووسیم**

**(تۆ) نووسیت : ( ـ ) نووسیت**

**(ئەو) نووسی : ( ـ ) نووسی**

**(ئێمە) نووسیمان : ( ـ ) نووسیمان**

**(ئێوە) نووسیتان : ( ـ ) نووسیتان**

**(ئەوان) نووسییان : ( ـ ) نووسییان**

بە هەمان شێواز، هەر سێ جۆرەکەی تری رابردوو ئەم بکەر بەزێنییە پەسەند دەکەن، وەك:

**ـ رابردووی بەردەوام:**

**(من) دەڕۆیشتم : ( ـ ) دەڕۆیشتم**

**(من) دەم نووسی : ( ـ ) دەم نووسی**

**ـ رابردووی دوور:**

(من) رۆیشتبووم : ( ـ ) رۆیشتبووم

(من) نووسیبووم : ( ـ ) نووسیبووم

**ـ رابردووی تەواو:**

**(من) رۆیشتووم : ( ـ ) رۆیشتووم**

**(من) نووسیومە : ( ـ ) نووسیومە**

تەنانەت، کاری (ئاندن) و (بکەر نادیار)یش، دیاردەی (بکەر بەزێنی) پەسەند دەکەن، وەك:

**ـ کاری (ئاندن)، تێپەڕ:**

**(من) سووتاندم : ( ـ ) سووتاندم**

**(تۆ) سووتاندت : ( ـ ) سووتاندت**

**(ئەو) سووتاندی : ( ـ ) سووتاندی**

**(ئێمە) سووتاندمان : ( ـ ) سووتاندمان**

**(ئێوە) سووتاندتان : ( ـ ) سووتاندتان**

**(ئەوان) سووتاندیان : ( ـ ) سووتاندیان**

**ـ کاری (بکەر نادیار)، تێنەپەڕ:**

**(من) نووسرام : ( ـ ) نووسرام**

**(تۆ) نووسرایت : ( ـ ) نووسرایت**

**(ئەو) نووسرا : ( ـ ) نووسرا**

**(ئێمە) نووسراین : ( ـ ) نووسراین**

**(ئێوە) نووسران : ( ـ ) نووسران**

**(ئەوان) نووسران : ( ـ ) نووسران**

چوارەم: لە رووبەری کاری (بوون و هەبوون)دا:

لە رووبەری کاری بوون و هەبووندا هەمان میکانیزم هەیە و دەشێت بکەری ڕستەکە فڕێ بدەین، وەك:

**- رانەبردوو:**

**(من) جوان م : ( ـ ) جوانم**

**(من) هە م : ( ـ ) هەم**

**- رابردوو:**

**(من) جوان بووم : ( ـ ) جوان بووم**

**(من) هە بووم : ( ـ ) هەبووم**

ئێستاش، دەتوانین هەڵوەستەیەك بکەین لە ئاستی ئەو رووبەرانەی کە میکانیزمی (بکەر بەزێنی)ی تێدا ناچەسپێت، وەك:

**- کاری (بوون):**

لە کاری (بوون)دا، لە رووبەرێکی زۆر زۆر هورد و بەر تەسکدا، دیاردەی ( بکەر بەزێنی) ناچەسپێت، وەك:

**(مـن) م : ( ـ ) م ( × )**

**(تۆ) یت : ( ـ ) یت (×)**

**(ئـەو) ە : ( ـ ) ە (×)**

(ئێمه) ین : ( ـ ) ین (×)

(ئێوه) ن : ( ـ ) ن (×)

(ئەوان) ن : ( ـ ) ن (×)

به سەرنجێکی هورد له ڕێژەکانی (بوون) دەردەکەوێت ، کە بریتین لە ئەوانەی (دەستە ڕاست)، ناتوانن بکەری ڕستەکە لابدەن. هەر لەبەر ئەوە هێمای ئەستێره (×) دانراوه بۆ ڕێژەکانی (دەستە چەپ). بە هەمان شێوە، لە ڕستەی (نیازداری) و (گومانداری)دا ئەو دیاردەیه ناچەسپێت، وەك:

**با (من) بام : با ( ـ ) بام (×)**

**ڕەنگە (من) بم : ڕەنگە ( ـ ) بم (×)**

**ـ <u>ئامرازی گەیەنەر</u>:**

له ئەم جۆره بابەتەدا، دیاردەی (بکەر بەزێنی) ناچەسپێت، وەك:

**ئەو (پیاو)ەی کە هات، گەڕایەوە**

یان

**ئەو ( ــ ) ەی کە هات، گەڕایەوە**

به سەرنجێکی هورد، دەردەکەوێت کە لابردنی وشەی (پیاو) لە دەستەواژەکە، (بکەر)ی ڕستەی (هات) هەر دەمێنێت و هەمان (بکەر) دەبێت بە (بکەر) بۆ کاری دووەم (گەڕایەوە). کەواتە، ئەگەر دەست بدەین لە قەوارەی (بکەری جودا)، ئەوا دەست دەدەین لە قەوارەی بابەتێکی ڕێزمانی لە چەشنی (ئامرازی گەیەنەر). لە هەل و مەرجی ئاوهادا، قەوارەی ئامرازی گەیەنەر تێك دەچێت. هەر لەبەر ئەو هۆیە، دیاردەی (بکەر بەزێنی) ناچەسپێت.

## ٣ـ پۆلینکردنی وشەسازییانە:

لەسەر بنەمای مۆرفۆلۆژی ( وشەسازی)، زمانانی بەندەی سەر زەوی بە جۆرێکی تر پۆلین کراون. لە ئەو پۆلینکردنەدا تێکهەڵکێش کردنی مۆرفیمەکان، لە بنیادی وشەدا، خراوەتە بەر بایەخ و لە ئەنجامدا سێ جۆر لە زمان پەیدابووە، وەك:

**یەکەم: زمانی دابڕاو (Isolating language).**

واتە، ئەو زمانانەی کە زۆربەی وشەکانی لە یەك مۆرفیم پێك هاتووە و لەنێوان مۆرفیمەکاندا (کەلێن) هەیە لە نووسیندا. بۆ نموونە، لە زمانی ئینگلیزیدا ئەو جۆرە تێك بەستە برەوی زۆرە و هەر لەبەر ئەوە دەبێت بە زمانێکی دابڕاو ناوببرێت.

**دووەم: زمانی نووسەکی (Agglutinative language).**

واتە، ئەو زمانەی کە لە بنیادی وشەدا، مۆرفیمەکانی لەدوای یەك ریز دەبن و ریز بەندێك کە روخساری (خانە خانە) پێك دەهێنن. لە جۆرە زمانی ئاوهادا، مۆرفیمەکان دەڵێیت بە کەتیرە نووساون بە یەکترییەوە. نموونەیەك بۆ زمانی نووسەکی بریتییە لە زمانی (تورکی) و زمانی (سەواحیلی).

**سێیەم: زمانی تێك تواوە (Fusional language).**

لە ئەم جۆرە زمانەدا، مۆرفیمەکان لە بنیادی وشەدا دەتوێنەوە بە یەکتریدا بە ئاسانی ناناسرێنەوە، یان لە یەکتری داناژەنرێن.

ئەم پۆلینکردنە، هەر چەندە کاریگەری خۆی هەبێت، بەڵام رەخنەی لەسەر هەیە، چونکە زمانەکان تێکەڵاوی پیشان دەدەن. بۆ نموونە، زمانی ئینگلیزی ئەگەر ئامار بکرێت لە جۆری یەکەم دەردەچێت (زمانی دابڕاو)، بەڵام لە جۆرەکانی تریشی تێدا هەیە. لە ئەم رووەوە وشەی (faith-full-ness) سیمای زمانی (نووسەکی) پیشان دەدات، چونکە مۆرفیمەکانی پێکەوە نووساون و ریزبەندێکی خانەییان چێ کردووە و دەشێت هەر مۆرفیمێك بە ئاسانی بناسرێتەوە. یان، لە وشەیەکدا (went) سیمای زمانی تێك تواوە هەیە، چونکە نیشانەی رابردوو بە جۆرێك تواوەتەوە کە جودا ناکرێتەوە.

سەبارەت بە زمانی کوردی، سیمای (نووسەکایەتی) زۆر بەربلاوە و مۆرفیمەکان بە جوانی ریز دەبن و پلیکانە دروست دەکەین. ئەم دیاردەیە لە گشت ئیشەکانی ئێمەدا باس کراوە و تەنانەت ریزبەندی خانەکانیش ژمارەرێژ کراون و پلیکانەیەك دروست کراوە بۆ رستەی زمانی کوردی، وەك:

**بریا نەسووتێنرا بووبا**

کە دەشێت مۆرفیمەکان بە ئەم چەشنە جودا بکرێنەوە:

**بریا نە [سووت / ێن / ر / ا / بوو / با]**

لە ئیشەکانی ئێمەدا، ئەو مۆرفیمانە کراون بە پلیکانەیەکی خانەخانە، وەك:

| | سفر | ١– | ٢– | ٣– | ٤– | ٥– |
|---|---|---|---|---|---|---|
| بریا نە | سووت | ێن | ر | ا | بوو | با |

لە ڕاستیدا، گشت ئیشەکانی ئێمە لەسەر (پلیکانەی ڕستە)، بریتین لە سەلمێنەری ئەوەی کە زمانی کوردی لەژێر رکێفی (پێکەوە نووسی) دایە، چونکە مۆرفیمەکان هەر چەند وەك ( موسنەك) پێکەوە نووسان، بەلاَم بە ئاسانی جودا دەکرێنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو دیاردەی پێوە نووسییە هەل و مەرجی دەنگسازی خۆی هەیە و دوو مۆرفیمی هاوجێ دەشێت تەشەنە لە یەکتری بکەن، وەك:

**<u>یەکەم:</u>** لە هەندێك جێدا، دیاردەی (نیمچە بزوێنایەتی) دەچەسپێت، وەك:

**شیلان [سووت ـ ان ـ د ـ ی]**

**شیلان [هێن ـ ا ـ ی]**

لە ئەو دوو نموونەیەدا، مۆرفیمی (ی) جارێك بە (بزوێن) دەردەکەوتووە و جارێکی تر بە (نەبزوێن).

**دووەم:** لەگشت جێیەکدا، نیشانەی رابردوو (د) رەگەزی تێپەڕاندن (ێـن) دەگۆڕێـت بە (ان)، وەك:

دە [سووت - ێن - م]

[سووت - ێن - ر - ا - بوو]

[سووت - ێن - ر - ا - و - ە]

[سووت - ان - د - بوو - م]

[سووت - ان - د - م]

لـە دوو نموونەکـەی دواییـدا، رەگـەزی (ێـن) روخـساری گۆڕیـوە بـۆ (ان) چـونکە نیشانەی رابردووە بریتییە لە دەنگی (د).

**سێیەم:** هەندێك جـار هـەل و مـەرجی فۆنۆلـۆژی وا دەکـات کـە کـەلێنی نێـوان دوو مۆرفیم پڕ بکرێتەوە، وەك:

من دە [ڕۆ - م]

من دە [ڕۆ (یشـ) - ت - م]

لە نموونەی دووەمدا، هاتنی نیشانەی رابردوو (ت) وای کردووە کە هەنـدێك دەنگـی (نێوانگر) پەیدا ببێت، تا بە جوانی بە یەکەوە بنووسێن.

**چوارەم:** لەکاری تێنەپەڕی ئەلفیـدا، وەك (سـووتان) یـان (سـووتێنران)، نیـشانەی رابردوو (آ) دەگۆڕێت بۆ نیشانەی رانەبردوو (ێ)، وەك:

من دەنووسرام

من دەنووسرێم

یان:

من دەسووتام

من دەسووتێم

لەگەڵ گشت ئەو دیاردە دەنگسازییانەدا، سیمای (نووسەکایەتی) بە ئاشکرا دیارە بە ئەو وشانەوە کە لەسەر بنجی کارێك رۆنراون، وەك:

**نووسینگە: [نووس - یـ - ن - گە]**

**نووسەر: [نووس - ەر]**

**نووسەرەکان: [نووس - ەر - ەکە - ان]**

**پێنووس: [پێ - نووس]**

**نووسراو: [نووس - ر - ا - و]**

## ٤ـ زمانی کوردی زمانێکی ئێرگەتیڤ:

لە رێزمانی (دۆخ)دا، دەشێت دۆخی (بکەر) و (دۆخی (بەکار) جودا بکەینەوە لە ڕستەدا. بۆ نموونە، لە رستەیەکدا، وەك:

I saw him

جێناوی کەسی یەکەمی تاك (I) لە دۆخی (بکەری) دایە و بە هیچ جۆرێك بە ئەو روخسارەوە ناتوانێت ببێت بە (بەرکاری). لە بەرانبەردا، جێناوی کەسی سێیەمی تاك (he) لە رۆڵی (بەرکاری) دایە و کراوە بە (him). واتە، جێناوی (he) نیشان کراوە و روخسارەکەی کراوە بە (him) بۆ ئەوەی مۆرکی رۆڵی بەرکاری پێوە دیار بێت. ئێستاش ئەگەر رۆڵی (بکەر) و رۆڵی (بەرکار) بکەین بە پێچەوانە، وەك:

He saw me

دەبینین مۆرکی دۆخی (بەرکار) جێناوی کەسی یەکەمی تاکی گۆڕیوە بۆ (me) و لە هەمان کاتدا مۆرکی (بکەر) جێناوی کەسی سێیەمی تاکی گۆڕیوە بۆ (He)، وەك:

**(جێناو + مۆرکی بکەری) : (I , He)**

**(جێناو + مۆرکی بەرکاری) : (me , him)**

کەواتە، هەر دوو جێناوی (I) و (me) دەگەڕێنەوە بۆ کەسی یەکەمی تاك، بەڵام بە دوو روخساری جیاواز بۆ دوو (دۆخ)ی جیاواز، کە بریتین لە رۆڵی (بکەر) و لە رۆڵی

(بەرکار). ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە رێزمانی دۆخ (case grammar) ناسراوە و زمانی (ئینگلیزی) بریتییە لە نموونەیەکی بەرچاو لە ئەم جۆرە رێزمانە، کە تێیدا زمانانی بەندەی سەر زەوی دابەش کراون بۆ دوو رژێم:

**رژێمی یەکەم:** دۆخی (بکەر - بەرکاری) (Nominative-accusative)

**رژێمی دووەم:** دۆخی (ئەرکگری - رەهایی) (Ergative-absolutive case)

لە رژێمی یەکەمدا، هەردوو جێناوی (I , He) لە دۆخی (بکەری)دان و هەر لەبەر ئەوە بە (nominative case) ناونراون و هەر دوو جێناوەکەی تر (me , him) لە رۆڵی (بەرکاری)دان، کە بە (accusative case) ناسراون.

بە ئەم پێیە زاراوەی (nominative- accusative) بەکارهێنراوە بۆ ئەو زمانانەی کە ئەو رژێمە دەیان گرێتەوە. لە کرمانجی خواروودا، ئەو جۆرە رژێمە برەوی نییە چونکە جێناوێکی جودا لە چەشنی (من) و لە چەشنی (ئەو)، بەرانبەر بە (I) و (He) لە ئینگلیزیدا، ئەو رژێمە پەیرەو ناکەن و دەتوانن بچنە نێو دۆخی (بکەر) و دۆخی (بەرکار)ەوە، بەبێ ئەوەی روخساریان نیشانە بکرێت، وەك:

**(من) (ئەو) دەبینم**

**(ئەو) (من) دەبینێت**

هەر لەبەر ئەوە دەبێت زمانەکەی خۆمان لەگەڵ رژێمی دووەمدا ریز بکەین، کە پێی دەگوترێت دۆخی (ئەرکگری - رەهایی). لە ئەم رژێمەی دواییدا، چەند ئاکارێك هەیە، وەك:

<u>**یەکەم:**</u> ئەو جێناوەی کە دەبێت بە (بکەر) لە کاری (تێپەڕ)دا، دەبێت بە (بەرکار) لە کاری (تێپەڕ)دا.

بۆ نموونە، لە زمانی کوردیدا پۆلە جێناوی (م، یت، - ، ین، ن، ن) دەبێت بە (بکەر) لە کاری تێنەپەڕدا، وەك:

**من خەوت (م)**

**تۆ خەوت (یت)**

**ئەو خەوت ( ـ )**

**ئێمە خەوت (ین)**

**ئێوە خەوت (ن)**

**ئەوان خەوت (ن)**

بە هەمان شێوە، هەمان ریزە جێناوی (م، یت، ـ ، ین، ن، ن) دەبێت بە (بەرکار) لەکاری تێپەڕدا، وەك:

**ئەوان ناردیان (م)**

**ئەوان ناردیان (یت)**

**ئەوان ناردیان (-)**

**ئەوان ناردیان (ین)**

**ئەوان ناردیان (ن)**

**ئەوان ناردیان (ن)**

کەواتە، لە رێزمانی دۆخدا، دۆخی (بکەری) لە کاری (تێنەپەڕ)دا یەکسان بوو بە دۆخی (بەرکاری) لەکاری (تێپەڕ)دا. لە ڕاستیدا، ئەم دۆخە دوو لانەیە، لەنێوان کاری تێپەڕ و تێنەپەڕدا، بە دۆخی (رەها) ناسراوە (absolute) و ئەو رۆڵەی کە (بکەر)ی کاری (تێپەڕ) دەی گێڕێت بە رۆڵی (ئەرکگری) ناسراوە، کە پێی دەگوترێت (ergative). هەر لەبەر ئەو هۆیە، رژێمی دووەم، لە رێزمانی دۆخدا، بە دۆخی (ئەرکگری ـ رەهایی) ناسراوە و بەزاراوەی (ergative) یان بە زاراوەی (-ergative absolutive) ناوبراوە.

## ٥ـ سروشتی زمانی کوردی

لەسەر خشتەی (٣) پەیوەندی نێوان (جێناوی لکاوی بکەر) و (جێناوی لکاوی بەرکار)، لەگەڵ (کار)دا نیشان دراوە. ئەو خشتەیە گشت رووبەرەکانی زمانەکە دەگرێتەوە و بە سەرنجێکی وردیش دەردەکەوێت:

**یەکەم:** سیمای (ئێرگەتیڤ) لە چارەکی دووەمدا هاتووەتە ئاراوە، چونکە بکەری کاری تێنەپەڕ (مَ، یتَ، ـەَ، ینَ، نَ، نَ) ئەرکی گۆڕیوە بۆ (بەرکار) لە رستەی تێپەڕدا.

**دووەم:** لە چارەکی سێیەمدا، هەمان میکانیزم هەیە و بکەری کاری تێنەپەڕ یەکسان بووە بە بەرکاری کاری تێپەڕ.

**سێیەم:** لە چارەکی چوارەمدا، کە لەسەر خشتەی (٤) فراوان کراوەتەوە بۆ هەر چوار جۆرەکەی رابردوو، بەگشتی (بکەری کاری تێنەپەڕ) بووە بە (بەرکار) لە کاری تێپەڕدا.

واتە، ریزە جێناوی (م، یت، ـ ، ین، ن، ن)لە کاری تێپەڕدا (خەوتن) بە (بکەر) دەرکەوتووە، کەچی هەمان ریزە جێناوە لە کاری تێپەڕی (نووسین)دا، وەك (بەرکار) دەرکەوتووە.

**چوارەم:** لە چارەکی یەکەمدا، دیاردەی (ئێرگەتیڤایەتی) لە ئارادا نییە. و ریزە جێناوی ( م، یت، ێت، ین، ن، ن) لە کاری (تێنەپەڕ) و لە کاری (تێپەڕ)دا رۆڵی (بکەر)دا دەرکەوتووە. بە واتایەکی تر، دیاردەی (ئێرگەتیڤایەتی) لە دەمکاتی رانەبردوودا برەوی نییە.

**پێنجەم:** بەپێی خاڵی پێشوو و لەبەر رووناکی خاڵەکانی پێشتر، لە زمانی کوردیدا دیاردەی (split-ergativity) لە ئارادایە. ئەوەش لە یاد نەکەین کە ئەم دیاردەیە زۆر بەربڵاوە، بەتایبەتی لە ئاستی (دەمکات)دا.

کەواتە، دیاردەی (split-ergativity) بە شێوەیەکی لەت کراو روویداوە. لە ئەو لەتەدا، کە بریتییە لە (دەمکاتی رانەبردوو)ی گشت کارەکان بێجگە لە (بوون و هەبوون)، ئەو دیاردەیە لە ئارادا نییە. پاشان، لە رانەبردووی کاری (بوون و هەبوون)دا لە دایك بووە و ئەمجار بە لەتەکەی تردا کە بریتییە لە (دەمکاتی رابردوو)، بەگشتی بڵاوبووەتەوە.

کەواتە، دیاردەی لەتکردنی (ئێرگەتیڤایەتی) کە پێی دەگوترێت ( split ergativity) لەسەر بگۆڕی (دەمکات) روویداوە. واتە، دەمکاتی رستە (tense) بووە بەهۆی ئەوەی کە (ئێرگەتیڤایەتی) پارچەیی بێت و هەر رانەبردووی (بوون و

هەبوون) و رابردووی گشت کارەکان بگرێتەوە. بە واتایەکی خنجتر و قنجتر، دیاردەی (ئێرگەتیڤایەتی) لە رانەبردووی کاری (بوون و هەبوون)دا روویداوە و بەرپا بووە، (خشتەی ٣، چارەکی دووەم)، ئەمجا بە رووبەری رابردوودا بڵاوبووەتەوە، (خشتەی ٤).

خشتەی (٣): باری ئێرگەتیڤایەتی لە زمانی کوردیدا،

واتە (بکەری تێنەپەڕ = بەرکاری تێپەڕ)

# خشتەی (٣)

وینە

**نەخشەی (٤): باری ئێرگەتیڤایەتی لە چوار جۆرەکەی ڕابردوودا**

| چاوگ | ڕابردوو | تێنەپەڕ: بکەر | | تێپەڕ: بکەر | | | تێپەڕ: بەرکار | | باری ئێرگەتیف |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| چاوگی سێیەم (ڕابردووی تەواو) | | خەوتوو | مَ | نووسیوو | م ـە | | نووسیویان | مَ | |
| | | خەوتوو | یتَ | نووسیوو | ت ـە | | نووسیویان | یتَ | |
| | | خەوتوو | ـەَ | نووسیوو | (ی) ـە | | نووسیویان | ـەَ | |
| | | خەوتوو | ینَ | نووسیوو | مان ـە | | نووسیویان | ینَ | |
| | | خەوتوو | نَ | نووسیوو | تان ـە | | نووسیویان | نَ | |
| | | خەوتوو | نَ | نووسیوو | یان ـە | | نووسیویان | نَ | گشت |
| | | D | | | | | | D | ئێرگەتیف |
| چاوگی چوارەم: ڕابردوو (جگە لە ڕابردووی تەواو) | ڕابردووی نزیک | خەوت | م | نووسیـ | م | | نووسیان | م | all- |
| | | خەوت | یت | نووسیـ | ت | | نووسیان | یت | ergative |
| | | خەوت | — | نووسیـ | ی | | نووسیان | — | |
| | | خەوت | ین | نووسیـ | مان | | نووسیان | ین | |
| | | خەوت | ن | نووسیـ | تان | | نووسیان | ن | |
| | | خەوت | ن | نووسیـ | یان | | نووسیان | ن | بکەری |
| | ڕابردووی بەردەوام | دەخەوتـ | م | دە | م | نووسی | دەیان نووسیـ | م | کاری |
| | | دەخەوتـ | یت | دە | ت | نووسی | دەیان نووسیـ | یت | (تێنەپەڕ) |
| | | دەخەوتـ | — | دە | ی | نووسی | دەیان نووسیـ | — | یەکسانە |
| | | دەخەوتـ | ین | دە | مان | نووسی | دەیان نووسیـ | ین | بە |
| | | دەخەوتـ | ن | دە | تان | نووسی | دەیان نووسیـ | ن | بەرکاری |
| | | دەخەوتـ | ن | دە | یان | نووسی | دەیان نووسیـ | ن | کاری |
| | ڕابردووی دوور | خەوتبوو | م | نووسیـبوو | م | | نووسیبوویان | م | (تێپەڕ) |
| | | خەوتبوو | یت | نووسیـبوو | ت | | نووسیبوویان | یت | |
| | | خەوتبوو | — | نووسیـبوو | ی | | نووسیبوویان | — | |
| | | خەوتبوو | ین | نووسیـبوو | مان | | نووسیبوویان | ین | |
| | | خەوتبوو | ن | نووسیـبوو | تان | | نووسیبوویان | ن | |
| | | خەوتبوو | ن | نووسیـبوو | یان | | نووسیبوویان | ن | |

## ٦ـ نموونەیەك لە شیتەڵكاریدا

لە نموونەیەكدا، وەك:

**ئێمە ئێوەمان دەنووسی**

دەتوانین، هەر چوار خەسڵەتەكە لێك بدەینەوە، وەك:

**یەكەم:** لە ئەو نموونەیەدا، ریزبەندی [بكەر (ئێمە)، بەركار (ئێوە)، كار (دەمان نووسی)] لە ئارادایە. واتە هێمای (SOV) چەسپاوە.

**دووەم:** سەبارەت بە خەسڵەتی (پرۆدرۆپ) دەشێت بكەری (ئێمە) بسڕینەوە، وەك:

**(....) ئێوەمان دەنووسی**

**سێیەم:** سەبارەت بە زمانی نووسەكی (agglutinative language)، دەتوانین مۆرفیمەكان بە خنجی لە یەكتری جودا بكەینەوە و هیچ مۆرفیمێك نییە كە ئەو دیاردەیە پەسند نەكات، وەك:

**[ئێمە ـ ئێوە ـ مان ـ دە ـ نووس ـ ی]**

**چوارەم:** بۆ ئەوەی تێبگەین لە ئەو راستییەی كە زمانەكەمان لە جۆری ئێرگەیتیڤە، دەتوانین بەركاری (ئێوە) بكەین بە جێناوی لكاو, وەك:

**ئێمە دەمان نووسیـ (ن)**

ئێستا ئەگەر بەركاری (ئێوە) بخەینە سەر كارێكی تێنەپەڕ، وەك (خەوتن)، وەك:

**ئێوە دەخەوتـ(ن)**

دەبینین كە جێناوی (ن) لە ڕستە تێپەڕەكەدا بەركارە و لە ڕستە تێنەپەڕەكەدا بكەرە. واتە، دیاردەی (ergativity) لە ئارادایە.

كەواتە، هەر چوار خەسڵەتەكە ماكی خۆیان پیشان دا بە ڕستەی زمانی كوردییەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، مەرج نییە هەر خەسڵەتێك بە تەواوەتی بچەسپێت، بەڵام دەشێت بەسەر زۆربەی زمانەكەدا بچەسپێت.

## ٧ـ پوختەی خەسڵەتەکانی زمانی کوردی

بەپێی ئەو زانیارییانەی کە لە پێشەوە باس کران، دەتـوانین خەسـڵەتەکانی زمـانی کوردی دیاری بکەین، بەم چەشنە:

**خەسڵەتی یەکەم**: لە بیردۆزی ڕیزبەندی وشـەدا (word order)، زمـانی کـوردی لـە تـەرزی سـۆڤە (SOV). واتـە، ڕیزبەنـدی کۆلکـە سـەرەکییەکانی ڕسـتە بـە ئـەم چەشنەیە:

[بکەر ← بەرکار ← کار]: SOV

بەپێی ئاماری زمانەکان، ئەم جۆرە ڕیزبەندە بریتییە لە بەربلاوترین جۆری زمانانی بەندەی سەر زەوی.

**خەسڵەتی دووەم**: زمانەکـەمان لـە تـەرزی بکـەر بەزێنـە (pro-drop). واتـە، لـە بەزاندنی (بکەر)دا زمـانی مـرۆڤ دابـەش دەبێـت بـۆ (بکـەر بـەزێن) و (بکـەر پـارێز). بـە واتایەکی زمانی کوردی لە ئـەو تەرزەیـە کـە دەتوانێـت بکـەری لابـدات، چـونکە (بکـەر) نیشانەی خۆی هەیە لەسەر کار، کە بە (جێنـاوی لکـاو) ناسـراوە. کەواتـە دەتـوانین بـە زمانەکەمان بڵێین (pro-drop language) لە ئەم جۆرە زمانەدا، ژمارەی ڕسـتەکان دەبێت بە (دووبارە)، چونکە هەر ڕستەیەك دوو باری هەیە، وەك باری (بکەر پـارێزی) و باری (بکەر بەزێنی).

**خەسڵەتی سێیەم**: بەپێی بیردۆزی دابەشبوونی مۆرفیم لـە بنیـادی وشـەدا، زمـانی کوردی لە تەرزی (نووسەکی)یە. واتە، مۆرفیمەکانی وشەی زمانی کوردی یـەك یـەك ڕیـز دەبن بەدوای یەکدا و پێکـەوە دەنووسـێن و بنیـادی (وشـە) دروسـت دەکـەن. لـە ئـەم ڕووەوە، زمانی بەندەی سەر زەوی دابەش کراوە بۆ سێ تەرز، وەك:

ـ زمانی دابڕاو (Isolating language)

- زمانی نووسەکی (agglutinative language)

- زمانی تێك تواوە ( fusional language)

زمانەکەی ئێمەش لە تەرزی دووەمە، کە پێی دەگوترێت ( agglutinative language). ئەم جۆرە زمانە سیمای (خانەرێژی) هەڵدەگرن و پلیکانەیەکی ئەندازیارییانە دەبەخشن بە بنیادی وشەکان.

**خەسڵەتی چوارەم:** بەپێی ڕێزمانی دۆخ، دوو جۆر لە پەیوەندی نێوان (بکەر، بەرکار، کار) هەیە.

جۆری یەکەم پێی دەگوترێت دۆخی (بکەر - بەرکاری) بە واتای (nominative-accusative case).

جۆری دووەم پێی دەگوترێت دۆخی (ئەرگگری) بە واتای (ergative) یان (ergative-absolutive).

لە ئەم دابەشبوونەدا، زمانی کوردی ڕوو دەکات لە جۆری ( ergative language ).

بە شێوەیەکی گشتی، دەتوانین گشت خەسڵەتەکان لە خشتەیەکدا کۆ بکەینەوە، تا لەسەر ئەو خشتەیە خەسڵەتەکانی زمانی کوردی بە وردی دەربخەین، خشتەی (٥). لە پاشتردا، لەسەر خشتەی (٦)، دەتوانین دەستە خوشکەکانی کوردی دەربخەین، بۆ ئەوەی بە بەراوردێکی سفت و سۆڵ ڕیزبەندەکەی بدۆزینەوە لەنێو زمانە سروشتییەکاندا.

خشتەی (٥): خەسڵەتەکانی زمانی کوردی (رووبەرە تاریک کراوەکان)

| **خەسڵەتەکان** | **تەرزەکان** | **نموونە** |
|---|---|---|
| خەسڵەتی یەکەم | SOV | زمانی کوردی |
| | SVO | – |
| | VSO | – |
| | VOS | – |
| | OVS | – |
| | OSV | – |
| خەسڵەتی دووەم | Pro-drop | زمانی کوردی |
| | none | – |
| خەسڵەتی سێیەم | Isolatiug | – |
| | agglutiuative | زمانی کوردی |
| | Fusional | – |
| خەسڵەتی چوارەم | nominative-accusative | – |
| | ergative-absolutive | زمانی کوردی |

خشتەی (٦): دەستە خوشکەکانی زمانی کوردی بەپێی خەسڵەتەکان

| خەسڵەتەکان | دەستە خوشکەکانی زمانی کوردی<br>زمانە هاوتەرزەکان |
|---|---|
| SOV-language<br>ریزبەندی<br>(بکەر ـ بەرکار ـ کار) | باسکی، تورکی، یابانی، فارسی،... |
| Pro-drop language<br>دیاردەی<br>(بکەر بەزێنی) | ئیتالّی، ئیسپانی، لاتینی،.... |
| Agglutinative language<br>زمانی نووسەکی | یابانی، تورکی، سەواحیلی، هەنگاری، فینی، زمانگەلی بانتۆ لە ئەفریکا، هەندێك لە زمانگەلی ئەمەریکا و ئوسترالیا، زۆربەی زمانەکانی رووسیا |
| Ergative-absolutive language<br>دۆخی (ئەرکگری ـ رەهایی) یان، دۆخی (ئەرکگری) | باسکی، زمانگەلی ئەمەریکا لە چەشنی ئەسکیمۆ، هەندێك زمانی ئەفریکی، هەندێك زمانی ئاسیایی، وەك (تەبتی) |

## ٨ ـ جووتبوونی دوو خەسڵەت

لە کرمانجی خوارووا، دوو خەسڵەت تێکهەڵکێش دەبن. یەکەمیان بریتییە لە ریزبەندی سۆڤ (SOV) و دووەمیان بریتییە لە دیاردەی بکەر بەزێنی (pro-drop) لە ڕستەیەکدا وەك:

**شیلان جل دەشۆرێت**

ریزبەندی (SOV) لە ئارادایە، بەلاّم لە ئەو ڕستەیەدا دەشێت بکەری شیلان لاببەین، چونکە زمانەکەمان بکەر بەزێنە، وەك:

**ـــــ جل دەشۆرێت**

لە نموونەیەکی ئاوهادا، هێماکە دەبێت بە (-OV) بەلاّم نوێنەری بکەرەکە هەر ماوە لە ریزەکەدا، کە بریتییە لە نیشانەی (ێت)، کە وەك (جێناوێکی لکاو) پەیوەست

بووە بە کارەکەوە. هەر لەبەر ئەوە، دەشێت لەجیاتی هێمای (S)ی بچووك بار بکەین لە ریزەکە، وەك (OVs....)، یان دەتوانین هەردوو هێماکە دابنێین، وەك (SOVs).

هەر بۆ نموونـە، ڕسـتەی (شـیلان جـل دەشـۆرێت). دەشـێت بـەهێمای (SOVs) نیشانە بکرێت و ڕستەی (ــــــ جـل دەشـۆرێت) بـە هێمـای (-OVs) نیـشانە بکرێـت. بێگومـان، هێمـای (S)ی بـچووك هێنـدە رۆڵەکـەی گرنگـە و رەهایـە و نـەگۆڕە، دەبێـت فەرامۆش نەکرێت، چونکە بەهۆی ئەو جێناوەوە، توانراوە کە (بکەری جودا) لابېردرێت. بەواتایەکی تر، هێمای (S)ی بچووك بەرانبـەر بـە جێنـاوی لکـاو (ێـت) دەوەسـتێت، کـە نابێت لابچێت و هێمای (S)ی گەورە بەرانبەر بە ناوی (شیلان) دەوەستێت، کە دەشێت لابـچێت. کەواتــە، وەك (S)ی بـچووك، بریتییــە لــە بــەردی بناغــەی ڕســتە، دەشــێت بەرجەستە بکرێت لە ریزبەندەکەدا، چونکە رۆڵی ئەو گرنگترە لە رۆڵی (S)ی گەورە.

## ٩ـ زمانی کوردی و هەندێك خەسڵەتی تر

لە کرمانجی خوارووداً، هەندێك خەسڵەتی تر هەیـە لـە زمانەوانیـدا بـاس نـەکراوە و یان ئەگەر باس کرابێت، هەر ناوبراوە، وەك:

**یەکەم:** خەسڵەتی (جێگۆرکێی جێنـاوی لکـاو). لـە ئاسـتی ئـەم دیاردەیـەدا، ریـزە جێنـاوی (م، ت، ی، مـان، تـان، یـان) وزەیـەکی گـەورە هەڵـدەگرن بـۆ جێگـۆڕکێ بـە (بازبازێن) بەسەر پلیکانەی ڕستەدا و لەسەر دوا پلەی پلیکانەکە ڕادەوەستن ، وەك:




لە ئەم رێزە نموونەیەدا، جێناوی (م) سێ بازی داوە و لە هـەر ڕسـتەیەکدا، لەسـەر دوا کۆلکە وەستاوە. لە ڕاستیدا، ئـەم خەسـڵەتە زۆر زۆر دەگمەنـە و مـاکی مۆرکایـەتی هەڵدەگرێت.

**دووەم:** لە بیردۆزی (ئێرگەیتیڤ)دا، دۆخی (بکەر) لە کاری تێنەپەڕدا، یەکسان دەبێت بە دۆخی (بەرکار) لە کاری تێپەڕدا، ئەم دیاردەیە لە زمانی کوردیدا یەك لۆ نییە، بەڵکو بە دوو لۆیی دەچەسپێت. بۆ نموونە، لەنێوان دەمکاتی رانەبردوو و دەمکاتی رابردوودا، دۆخی (بکەری رانەبردوو) دەبێت بە دۆخی (بەرکاری رابردوو). لە هەمان کاتدا، دۆخی (بەرکاری رانەبردوو) دەبێت بە دۆخی (بکەری رابردوو).

ئەم دیاردەیە، خۆی لە خۆیدا بریتییە لە (میکانیزمی وەرچەرخان لە ئەرکی جێناودا)، وەك:




بە سەرنجێکی ورد دەبینین کە جێناوی (یان) لە ئەرکی (بەرکار)ەوە بووە بە ئەرکی (بکەر). یان جێناوی (ین) لە ئەرکی (بکەر)ەوە بووە بە (بەرکار).

**سێیەم:** لە دەمکاتی رانەبردوودا، دیاردەی (ئێرگەتیڤ) ناچەسپێت و ئەو ریزە جێناوەی کە کارەکە نیشانە دەکەن، هەر لە ئەرکی (بکەر)دا دەبن، چی بۆ کاری

(تێنەپەڕ) و چی کاری (تێپەڕ). ئەمەش وادەکات کە دیاردەی (split-ergativity) بچەسپێت، وەك:

| | | |
|---|---|---|
| **من دەخەو(م)** | : | **من دەنووسـ(م)** |
| **تۆ دەخەو(یت)** | : | **تۆ دەنووسـ(یت)** |
| **ئەو دەخەو(ێت)** | : | **ئەو دەنووسـ(ێت)** |
| **ئێمە دەخەو(ین)** | : | **ئێمە دەنووسـ(ین)** |
| **ئێوە دەخەو(ن)** | : | **ئێوە دەنووسـ(ن)** |
| **ئەوان دەخەو(ن)** | : | **ئەوان دەنووسـ(ن)** |

بە سەرنجێکی ورد دەرکەوتووە ریزە جێناوی (م، یت، ێت، ین، ن، ن) بە یەکسانی هەردوو کارەکەی نەخشاندووە، چی بۆ کاری تێنەپەڕ (خەوتن) و چی بۆ کاری تێپەڕ (نووسین).

**چوارەم:** لە کۆپلەکانی پێشتردا، جێ نزرگە و جێی لەدایکبوونی خەسڵەتی (ئێرگەتیڤ) بە جوانی و بە وردی و بە سفتی دیاری کراوە. واتە، خاڵی وەرچەرخان بەرەو (ئێرگەتیڤ) دیاری کراوە بە دەمکاتی (رانەبردوو) لە هەردوو کاری (بوون و هەبوون). لەسەر خشتەی (٣)، بە ئاشکرا دیارە کە لە چارەکی دووەمەوە دەستی پێکردووە.

**پێنجەم:** لەبەر رووناکی سێیەم، خەسڵەتی رەهایی بەسەر ریزە جێناوی (م، یت، ێت، ین، ن، ن)دا دەچەسپێت، چونکە لە (دەمکاتی رانەبردوو)دا دەبێت بە بکەرێکی (هاوبەش)، چی بۆ کاری (تێنەپەڕ) و چی بۆ کاری (تێپەڕ). لە بەرانبەردا، لەباری (ئێرگەتیڤ)دا، هەمان ریزە جێناو دەبن بە (بکەر) لە کاری رابردووی (تێنەپەڕ)دا و دەبن بە (بەرکار) لە کاری رابردووی (تێپەڕ)دا. هەر لەبەر ئەو هۆیە، ئێمە هەر لە سەرەتای نووسینەکانەوە، ئەم ریزە جێناوەمان بە (پۆلی یەکەم) ناوبردووە. لە بەرانبەردا، گشت رێزماننووسانی تر ئەم پۆلە بە (پۆلی دووەم) ناو دەبەن و پۆلەکەی تر (م، ت، ی، مان، تان، یان) بە پۆلی یەکەم ناو دەبەن.

## ١٠ـ پوختەکاری یەکەم:

لەڕووی ریزبەندی (کار) و (بکەر) و (بەرکار)ەوە، زمانەکانی بەندەی سەرزەوی دابەش دەبن بۆ شەش تەرزە زمان. لە ئەم دابەشکردنەدا، زمانی کوردی ریزبەندی (SOV)ی هەیە.

**دووەم:** ریزبەندی (SOV) بەربلاوترین جۆری زمانە و زمانەکەی ئێمەش کە ئەم جۆرەیە. بەشێوەیەکی گشتی ئەو دوو جۆرەی کە بە بکەر (S) دەست پێدەکەن، کە بریتین لە (SOV) و (SVO) زۆرترن لە ئەوانەی کە بە کار (V) دەست پێدەکەن. بە واتایەکی تر، ئەو دوو جۆرەی کە (بکەر ـ لەپێش)ن زۆر بە مەوداترن لە ئەو دوو جۆرەی کە (کار ـ لەپێش)ن. لە بەرانبەردا، ئەو دوو جۆرەی کە (بەرکار ـ لەپێش)ن زۆر دەگمەنن.

**سێیەم:** لەڕووی (بکەر بەزاندن)ەوە، زمانانی بەندەی سەرزەوی دابەش دەبن بە سەر دوو جۆردا، جۆری یەکەم بریتییە لە (زمانی بکەر بەزێن) و جۆری دووەم بریتییە لە (زمانی بکەر پارێز). زمانەکەی ئێمەیش (کرمانجی خواروو) لە جۆری (بکەر بەزێن)ە. ئەم خەسڵەتە وا دەکات کە هەر ڕستەیەك دوو باری هەبێت، وەك:

ـ باری (بکەر پارێزی)، وەك:

**من دەڕۆم**

ـ باری (بکەر بەزێنی)، وەك:

**ـ دەڕۆم**

کەواتە، بەرانبەر بە زمانێکی (بکەر پارێز)ی وەك ئینگلیزی، دوو بار هەیە بۆ ڕستەی (I go) و بۆ هەر ڕستەیەکی تر. ئەم دیاردەیە وا دەکات کە ژمارەی ڕستەکان ببێت بە (دووبارە)، یان هەر ڕستەیەك ببێت بە (دوودیو).

**چوارەم:** لەبەر ئەوەی لە ڕستەی زمانی کوردیدا، کۆلکەی (بکەر) دوو دیوی هەیە، واتە کۆلکەی (بکەر) نیشانەیەکی خۆی دادەنێت لەسەر کار بە (جێناوی لکاو)، دەشێت هێمای (SOV) هەموار بکەین. بۆ نموونە، دەشێت هێمای (S)ێکی بچووك بخەینە پاش هێمای کار (V) و بە هێمای (SOVs) تۆمار بکەین.

**پێنجەم:** کاتێک کە خەسڵەتی ریزبەندی (SOV) و خەسڵەتی بکەر بەزاندن (pro-drop) یەکتری دەگرن، دەشێت هێماکە بە ئەم چەشنە تۆمار بکەین:

- بۆ (بکەر پارێزی) هێمای (SOVs)
- بۆ (بکەر بەزێنی) هێمای (OVs-)

**شەشەم:** لەڕووی بنیادی مۆرفۆلۆژییەوە، زمانانی بەندەی سەر زەوی دابەش کراون بۆ سێ خێزانی سەرەکی و زمانەکەی ئێمەش دەگەڕێتەوە بۆ جۆری دووەم کە بریتییە لە زمانە نووسەکییەکان (Agglutinative languages). ئەم جۆرە زمانە، زۆر بە وردی و بە جوانی مۆرفیمەکان ریز دەکات و دەشێت هەر مۆرفیمێک ریزبەند و جێگای ئەندازیارانەی خۆی هەبێت و بە ئاسانیش جودا بکرێتەوە لە مۆرفیمەکانی دراوسێی. کەواتە، زمانەکەمان سیمایەکی ئەندازیاری هەیە و دەشێت بە زمانی پلیکانەیی (configurational language) ناوی ببەین و لەگەڵ زمانە نووسەکییەکان (agglutinative languages) ریزی بکەین.

**حەوتەم:** لەڕووی (رێزمانی دۆخ)ەوە، واتە لەڕووی دۆخی (بکەر) و دۆخی (بەرکار) لە بنیادی کاردا، زمانەکان دابەش کراون بۆ دوو خێزان، وەک:

**خێزانی یەکەم**: ئەو زمانانەی کە جێناوی (بەرکار)یان نیشانە کراوە، وەک جێناوی (him) بەرانبەر بە کەسی سێیەمی تاک (He). ئەم جۆرە زمانە بە (Nominative-accusative languages) ناسراوە، واتە زمانی (بکەر - بەرکاری).

**خێزانی دووەم**: ئەو زمانانەی کە لەجیاتی ئەوەی (بەرکار) نیشانە بکەن، بکەری (کاری تێنەپەڕ) دەکەن بە (بەرکار) بۆ (کاری تێپەڕ). ئەم جۆرە زمانە بە (Ergative-absolutive) ناسراوە، زمانەکەی ئێمەش سەر بە ئەم تەرزە زمانەیە.

**هەشتەم:** لە پێناسەیەکی جۆرانەدا، دەشێت بڵێین: [زمانی کوردی (بەتایبەتی کرمانجی خواروو) بریتییە لە تەرزە زمانێکی سۆڤ (SOV)، بکەر بەزێن، نووسەکی و ئەرکگری].

**تۆیەم:** زمانی کوردی (بەتایبەتی کرمانجی خواروو) پەیامی هەندێك خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەڵدەگرێت، کە رەنگە زۆر دەگمەن و دانسقە بێت لە زمانانی تردا، وەك (جێگۆڕکێی جێناوی لکاو، میکانیزمی وەرچەرخان لە ئەرکی جێناودا، ...).

## سەرچاوە:


بەشێوەیەکی راستەوخۆ کەڵك وەرگیراوە لە ئەم سەرچاوانەی خوارەوە، بۆ پۆلینکردنی زمانەکان و دۆزینەوەی نزرگەی زمانی کوردی لەم دابەشکردنەدا:

ـ د. شێرکۆ بابان، ئیشە بڵاوکراوەکانی خۆمان لەسەر رێزمانی کوردی.

ـ د. وریا عومەر ئەمین، چەند ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، هەولێر ٢٠٠٤، ل(٢٢–٢٣، ٦٩، ٨٩، ٢٣٦–٢٣٧، ٢٧٢، ٢٨٠، ٣٨٦–٣٩٦).

ـ د. تالیب حوسێن عەلی، ریزبوونی کەرەستەکانی ڕستەی سادە لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە(٤٣)، هەولێر ٢٠٠٣.

ـ مزگین عەبدولڕەحمان ئەحمەد، دۆخی ئێرگەتیڤ لە زمانی کوردیدا، کرمانجی سەروو، نامەی ماستەر، کۆلیژی پەروەردە، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ٢٠٠٦.

ـF. Katamba, Morphology, Macmillon press, England 1993.

- J. Aitchison, Linguistics, Britich library, London 1992

- A. Radford…, Linguistics an introduction, Cambridge university press, UK1999.

- R. Trask, A dictionary of grammatical terms in linguistics, Routledge, London 1993.

### *ملخص البحث*

# التصنيف النمطي للغة الكردية في علم اللغة المقارن

**د. شيركو بابان**

في علم اللغة المقارن، يتم تصنيف لغات العالم حسب أنماط قواعدها الى مجاميع كبيرة. وبخصوص اللغة الكردية يمكن تصنيفها حسب النقاط التالية:

* في اللغة الكردية يأتي (فاعل الجملة) في المقدمة و يليه (المفعول به) ومن ثم (الفعل) ولهذا السبب يمكن تصنيفها مع اللغات التي تخضع الى النمط (SOV)، مثل اللغة اليابانية واللغة التركية واللغة الباسيكية وغيرها.

* في اللغة الكردية يمكن حذف (الفاعل) في مقدمة الجملة لان دوره يعتمد على الضمير المتصل الذي يقابله وهذا يعني إنها تنتمي الى عائلة اللغات المعروفة بـ(pro-drop)، مثل اللغة الايطالية واللغة الاسبانية.

* من ناحية التصنيف الصرفي للكلمة المشتقة، تعتبر اللغة الكردية من اللغات الالتصاقية والتي يمكن فيها تشخيص وفصل المورفيمات المتتالية والمتلاصقة مع بعضها بسهولة، مثل اللغة التركية واللغة اليابانية واللغة السواحلية وغيرها.

* فيما يخص الحالة القواعدية للفاعل وللمفعول به مع الفعل المستعمل في الجملة، يمكن تصنيف اللغة الكردية مع عائلة اللغات المعروفة بـ(ergative-languages). مثل اللغة الباسيكية ومجموعات من اللغات الامريكية واللغات الآسيوية مثل اللغة التبتية.

## *Abstract*

# The typological classification of The Kurdish language in comparative linguistics

**Sherko Baban**

In comporative liguistics, the languages of the world are classified typologically into large groups. According to this classification the Kurdish language can be regrouped as in the following points:

- In (word order) theory, the Kurdish language has an order of (subject-object-verb) in its sentences. So, it is a (SOV) language, like Japanese, Turkish and Basque.
- The Kurdish language is a (pro-drop) language because the position of the subject can be left empty, like Italian and spanish.
- For the morphological typology, the Kurdish words have an (agglutinative) nature. So, it can be classified with agglutinative languages, like Turkish, Japanese and Swahili.
- In Kurdish language the subject of intransitive verbs and the object of transive verbs are treated identically. This means that it is an (ergative) language, like Basque, some American language and Asian language like Tibetan.

# (بەیت) و تیۆرییەكانی هۆنینەوەی (بەیت) لە ئەدەبیاتی میللی كوردیدا

## لێكۆڵینەوەیەكی ڕەخنەیی پڕاكتیكییە

ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا

مامۆستای یاریدەدەر لە بەشی زمانی كوردی كۆلێژی زمانی زانكۆی سەلاحەدین

## پێشەكی

ئەدەبیاتی میللی بە هۆی هەموو ئەو تایبەتمەندییە گرنگانەی هەیەتی ڕۆڵێكی گەورەی لە ژیانی نەتەوە بینیوەو دەبینێت، كاریگەری زۆری لەسەر بەجێهێشتووەو جێدەهێڵێت، فۆرمەكانی ئەو ئەدەبە وەكو ئەدەبیاتی فۆلكلۆر و وەكو ئەدەبیاتی هونەری بەرزیش بێگومان لە یەك جیاوازن، شیعر و چیرۆك و نوكتە و بەیت و ...هتد دەگرنەوە، لە نێو هەموویاندا دیارە (بەیت) شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، چونكە مەودایەكی فراوانتری هەیە، تیایدا بواری ئەوە هەیە لە هەردوو لایەنی ڕوخسار و ناوەڕۆكیش جوان و بەپێز، ڕێك و بەهێز، كاریگەر و سەرنجڕاكێش بكەوێتە بەر گوێ، واتە دەشێت شێوەی دەرەوەی جوان بێت و لە ناوەڕۆكیشدا شتی گرنگ و زۆر لەخۆوە بگرێت.

ئەم دەرفەتە كە بۆ بەیت دەڕەخسێت لە ئەدەبیاتی میللیدا بۆ بێجگەی بەیت نییە، بۆیە بەیت هەمیشە گرنگ بووەو بەیتبێژەكان بەناوبانگ و خۆشەویست بوونە، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا لێكۆڵینەوەیەكی زانستی ورد لە بارەی (بەیت)ەوە نەكراوە، كە بە تەواوی لە بنج و بناوان و شێوەو جۆرەكانی كۆڵدبێتەوەو ڕاستەقینەی ئەو فۆرمەو تیۆرییەكانی بە وردی دەستنیشان كردبێت، ئەمە وای لێ كردم لەم هەلەدا بە بنج و بناوانی (بەیت)ەوە شۆڕببمەوەو لە ناو (بەیت)دا پێناسەو جۆر و تیۆرییەكانی ئاشكرا بكەم، بەو ئومێدەی كارەكەم كەلێنێك لەو بوارەی لێكۆڵینەوە زانستییەكاندا پڕ بكاتەوەو خزمەتێك پێشكەش بكات.

# بەشی یەکەم
# پێناسەی (بەیت) و جۆرەکانی

**پێناسەی بەیت**

لێکۆڵەر کە بۆ پێناسەی (بەیت) دەگەڕێتەوە لە نێو سەرچاوەکاندا، دوای ماندووبوونیش ئینجا شتێکی زۆری دەست ناکەوێت، زۆرجار شتی وەها وەکو پێناسەی (بەیت) نووسراوە، ناکرێ بە پێناسەی (بەیت) پەسند بکرێت، بۆ نموونە:

ـ یەکێ لە پێناسەکەرانی (بەیت) دەڵێت: ((بەیت.. دەربڕی هەستێکی خۆشەویستییە، کە چۆن کوڕە لەبەر خاتری کچە ئامادەیە خۆی فیدا بکات)).[1]

بەڵام ئەم پێناسەیە پێناسەیەکی ناتەواوە، چونکە وادیارە بە تەنیا باس لە بەیتی ئەڤینی دەکات، هەرچی بەیتی قارەمانی و کۆمەڵایەتی و ئایینییە، ئەوان فەرامۆش دەکات، لەولاوەش باس لە زمانی هۆنینەوە کێش و گەلێ شتی تری تایبەت بە (بەیت) لەخۆ ناگرێت.

ـ پێناسەیەکی دیکە دەڵێت: ((بەیت: جۆرەکێ ڤەهاندنا شیعرییە، د ئەدەبیاتا کوردی دا ب مەبەستا گەهاندنا پەیامەکێ چ ب ڕێکا ئێکسەر وەك بەیتا (سەکەڕاتێ) و (قیامەتێ)، یان ب ڤەگێڕانا چیرۆك و بەسەرهاتییەکێ ـ کو گەلەك جارا هیچ ڕاستییەکا دیرۆکی ل پال نیینە، وەك بەیتا (حەتەم) و (هەسپێ ڕەش)، یان ئەگەر ڕاستییەکا دیرۆکی ل پال ژی هەبیت، خەیالا دانەری دەستکارییەکا مەزن تێدا کرییە، پەیام ژی پرانییا جاران ئایینەو هەر ئەڤ چەندە ژی بوویە، ئەگەر کو خەڵکێ مە ب چاڤەکێ پیرۆز لێ بنێڕیت و ژ دەست بۆ دەستی ڤەگێڕیت.

هەر دڤێ فۆڕمێ دا بابەتێن دی ژی هاتینە دەربڕین، وەك بەرز ڕاگرتنا قارەمانێتی و ئەڤینیێ و وەسفکرنا سروشتی و دەوروبەران و جارنا ب شێوەکێ ساتیر و کاریکاتێر وەك بەیتا (کێچا)...)).[2]

ئەم پێناسە لەوەی یەکەم وردترە، بەڵام دیسانەوە ئەوەش بێ کەموکوڕی نییە، چونکە:

١ـ دەستنیشانی نەکردووە، کە (بەیت) دەکەوێتە خانەی کام بەشی ئەدەبی کوردی، کە دەبوو بڵێ: دەکەوێتە خانەی ئەدەبی میللی کوردی، دەنا دەشێ زەینی خوێنەر بۆ بەشەکانی دیکەی (فۆلکلۆر) و (هونەری بەرز)یش بڕوات.

٢ـ لە پێناسەکەدا ئاماژە بەوە کراوە، کە (بەیت) لە ڕاستییەوە واتە لە واقیعەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو زادەی خەیاڵە، ئەگەرناش خەیاڵ هەر ڕۆڵی سەرەکیی تێدا دەگێڕێت، وەکو هاتووە: ((گەلەك جارا هیچ ڕاستییەکا دیرۆکی ل پاڵ نیینە، وەك بەیتا

(حەتەم) و (هەسپێ ڕەش)، یان ئەگەر ڕاستییەکا دیرۆکی ل پال ژی هەبیت، خەیالا دانەری دەستکارییەکا مەزن تێدا کرییە...))، کە لە ڕاستیدا بەشی یەکەمی ئەو گوتەیە بەو شێوەیە زۆر ورد نییە، چونکە بەیتە گرنگەکانی ئەدەبیاتی میللی کوردی، هەرکامیان بگری، چ (بەیتی ئەوڕەحمان پاشای بابان) بێت، چ (بەیتی زەمبیل فرۆش) بێت، چ (بەیتی سەکەڕاتێ) و (قیامەتێ) بی، وەکو پێناسەکە ئاماژەی بەو دووانەی دوایی کردووەو گەلێ بەیتی دیکەش لە واقیعدا سەرچاوەیان گرتووە، ئینجا خەیاڵ وەکو ڕەگەزێکی ئەدەبی ڕۆڵی لە هۆنینەوەیان داڕشتەوە.

٣ـ لە پێناسەکەدا وا خراوەتە ڕوو، کە: (پەیام ژی پرانییا جاران ئایینەو هەر ئەڤ چەندە ژی بوویە، ئەگەر کو خەلکێ مە ب چاڤەکێ پیرۆز لێ بنێڕیت و ژ دەست بۆ دەستی ڤەگێڕیت)، ئەمەش دیارە ورد نییە، چونکە پەیامی بەیتەکان زۆربەی جارەکان ئایینی نییە، بەڵکو زۆرجار قارەمانی و ئەڤینی و پڕ لە باسی دیکەی کۆمەڵایەتییە.

ـ بەڵام لەلای (د. مارف خەزنەدار)دا کە لە گەلێ شوێنی زنجیرە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (مێژووی ئەدەبی کوردی) هاتۆتە سەر وەسف و پێناسەکردنی بەیت، ئەو زانیاری زیاتری داوەو ڕوونی کردۆتەوە، کە مەبەست لە بەیت چییەو چ مەکانەیەکی هەیە لە نێو قەسیدە درێژە چیرۆکئامێزەکاندا، بە لای بەڕێزیان، بەیت: ((بەشێکی شیعری (ئیپێك)ە، ئەو جۆرە بەرهەمەیە، کە گیانی چیرۆکی تێدایە، لە جێ و سەردەم و قارەمان و جوولانەوە... بە قەوارە زۆر درێژ نییە، زمانی میللییەو ڕستەی ساکارە، زۆربەی خەڵك تێی دەگا، کێشی خۆماڵییەو قافیەی ڕەنگاوڕەنگە، لەسەر بنچی بەند دادەنرێ...))[٣]، هەروەها دەڵێت: ((بەیت وەکو بابەتێکی چیرۆکی شیعری زیاتر بۆ مەبەستی گۆرانی چڕین دادەنرێ، خەریکی دڵداری و خۆشەویستی و سروشتە، هەروەها ڕووداوی مێژوویی و قارەمانیەتی و پاڵەوانیی نەتەوە لە شۆڕش و جەنگ و بەرگری لە نیشتمان دەگرێتەوە))[٤]، لە شوێنێکی دیکەشدا لە ڕووی ناوەڕۆکەوە وەسفی بەیت دەکات و دەنووسێت: (( لە ڕووی ناوەڕۆکەوە هونەرێکی یەکجار کۆنە، هەموو شاعیرانی کورد ئەوانەی کێشی خۆماڵییان بەکارهێناوەو پەیڕەوی ئەدەبی میللییان کردووە، ئەم هونەرەیان بۆ داڕشتنی بیر و خەیاڵ و ئەندێشە و تێبینی بەرانبەر بە ژیانیان بەکارهێناوە، دیارە ئەمجۆرە هونەرە لەسەر بنچینەی ڕووداو و گێڕانەوەی دڵداری و کۆمەڵایەتی و ئایینی و سۆفیزم و هی تر دادەمەزرێ، بێگومان کەم و زۆر گیانی ئیپێکی (مەلحەمی)ی تێدایە))ـ[٥]

بەمەش (د. خەزنەدار) تەواوی لایەنەکانی (بەیت)ی ڕوون کردۆتەوەو گرنگی و جۆر و شێواز و مەکانەو هی تری ئەو فۆڕمە ئەدەبییەی میللی ڕوون کردۆتەوە، کە لە

بەر تیشکی ئەم باسانەی (د. مارف خەزنەدار) سەبارەت بە (بەیت) دەتوانین بلێین پێناسەیەکی نویَ بۆ ئەو هونەرە بکەین و بلێین: بەیت هونەرێکی شیعری خۆماڵییە، بە کێشی پەنجە دەنووسرێتەوە، زمانی دەربڕینی ساکارەو نزیکە لە تێگەیشتنی زۆرینە، لە داستان نزیکە، بەلاّم لێیشی جیاوازە، لەبەر ئەو وەسفانەی پێشووی، هی سەردەمی بەر لە سەرهەڵدانی ئەدەبیاتی هونەری بەرزە، زیاتر لە جۆرێکی هەیە، وەکو کۆمەلاّیەتی و ئەڤینی و قارەمانی، دەکەوێتە خانەی ئەدەبیاتی میللی نەتەوەیی.

**ـ جیاوازی نێوان بەیت (پۆێێم) لەگەڵ داستان (ئیپیك)**

١ـ شانۆی ڕووداو و سەردەم و کات لە بەیتدا فراوان و درێژ نییە[٦]، بەلاّم لە داستاندا درێژە.

٢ـ بەیت بە کێشی پەنجە دەهۆنرێتەوە بەلاّم داستان بە کێشی عەرووزی دەهۆنرێتەوە.

٣ـ بەیت هی سەردەمێکی زووترە، سەردەمێك کە خوێندەواری سنووردارترەو هێشتا ئەدەبیاتێکی هونەری بەرز سەری هەڵنەداوە، بەلاّم داستان هی قۆناغی ئەدەبیاتی هونەری بەرزە، کە ئەدەبیات بەرەوپێش هاتووە.

٤ـ شاعیرانی میللی ئەوانەی بەیت دەهۆننەوە بە قەد شاعیری داستاننووس خاوەن زانست و شارەزایی و مەعریفە نین و جیهانبینییان تەسکترە.

**ـ گرفتەکانی لێکۆڵینەوە لە بەیت:**

لە کاتی لێکۆڵینەوە لە بەیتدا کۆمەڵێك کێشەو گرفت دێنە پێش لێکۆڵەر لەوانە گرنگترینیان:

١ـ کەمی لێکۆڵینەوە لە ئەدەبیاتی میللی و فۆڕم و بەشەکانی.

٢ـ ئەو لێکۆڵینەوانەی هەشن زۆریان تێکەڵییان لەو بارەیەوە لە نێوان بەیت و داستان لە لایەك و بەیت و حەکایەت لە لایەکی دیکەوە دروست کردووە، بۆ نموونە: کامەران موکری لە باسی داستانی قارەمانیدا، دەنووسێت: ((لەم چەشنە داستانە لە کوردیدا زۆرن وەکو بەیتی (سوارۆ)ی شەریف هەمەوەند...))[٧]،

دەبینین لێرەدا نووسەر قسەی لە (داستان) بووە، کەچی نموونەی بە (بەیت) هێناوەتەوەو تەواو وەکو یەکی ژماردوون!

٣ـ تێکەڵکردنێك هەیە لە نێوان (بەیت) و (داستان) و (حەکایەت)، کە هەندێ نووسەر بە دروستی ئەو فۆڕمانە لێك ناکەنەوە، بۆیە هەندێ جار ناوی داستان و هەندێ

جاری دی ناوی حیکایەت خراوەتە سەر بەیت، بۆ نموونە بـەیتی (چـل تـووتی) نـاونراوە (حیکایـەتی چـل تـووتی)، بـەیتی (خـەج و سـیامەند)یـش نـاونراوە داسـتانی خـەج و سیامەند، کە لە ڕاستیدا (چل تووتی) گەورەترە لەوەی (حەکایەت) بێت و لە فۆڕمدا لـە حەکایەت جیاوازە، چونکە بە شیعر هۆنراوەتەوەو تیۆرییەکانی بەیتی تێدا ڕەچاوکراوە، (خەج و سیامەند)یش بچووکترە لەوەی (داستان) بێت، بـەڵام هـەردووکیان تـەواوی ئـەو تایبەتمەندییانەیان تیایە کە لە (بەیت)دا هەیـە، بۆیـە هـەردووکیان (بـەیت)ن، هـەروەها هەندێ جاری دی زۆر حەکایەت بە بەیت ناونراوە، بۆ نموونە بـەیتی ئایـشەگوڵ و بـەیتی لەشکری، کە ئەمانەش حەکایـەتن و بـە پەخـشان داڕێـژراون، کەچـی نـاوی (بـەیت)یـان لێنراوە ![٨]

- هۆیەکانی دروستبوونی تێکەڵی

١ـ نەبوونی لێکۆڵینەوەی زانستی ورد لەسەر هەر یەکە لەو فۆڕمە ئەدەبییانە.

٢ـ زۆربـەی بەیتـەکان بـە (بـەیت) و بـە (داسـتان)یـش هـەن، وەکـو لـە خـواروودا ئاماژەی بۆ کراوە.

٣ـ زۆری نووسـینی کورتـە وتـار و بابـەتی بـچووکی دوور لـە بـەهای زانـستی، کـە خاوەنەکەی بە میزاج و کەمحاڵی بوونی خۆی لە بابەتەکان بە یەکیان تێکەڵ دەکات.

- چۆنیەتی ڕزگاربوون لە گرفتەکان

بۆ ڕزگار بوون لەو گرفتانەی لە کاتی لێکۆڵینەوە لە (بـەیت) دێنـە پـێش لێکۆڵـەر، دەشێ سوود لەو پرەنسیپانەی خوارەوە وەربگرێت:

١ـ هەموو ئەو مادانەی دەکەوتە بەرچاوی مامەڵەی زانـستییان لەگـەڵ بکـات و بـێ وردبوونەوەو لێکۆڵینەوەیان، هەر یەکسەر زانیارییـەکانی سـەریان نەگوازتـەوە، چـونکە بەمە هەمان هەڵەی پێشوو دووبارە دەکاتەوە.

٢ـ لە هەموو ئەو فۆڕمە ئەدەبییانەوە وەکو پێویست لێکۆڵینەوەی زانستی بخەینـە بەردەست و نێو کتێبخانەکان.

٣ـ نووسەران لـە نووسـینەکانیان وردبـن و بـە هەسـتیارییەوە مامەڵـە لەگـەڵ ئـەو بابەتانە بکەن، نەك هەر بە سەرپێیی.

## هەندێ تایبەتمەندی (بەیت)

١ـ لە ڕووی مۆرکەوە (بەیت) مۆرکی نەتەوەیی پێوە دیارە، چونکە خاوەنی دیارە، قارەمانەکانی دیار و ناسراون، ئەو زەمینە دەناسرێتەوە، کە ڕووداوەکانی (بەیت)ەکەی تێدا ڕووداوە، داب و نەریت و سلوکیاتی قارەمان و کەسەکانی دیکەی دەوروبەری هەمووی دەناسرێنەوەو دیارن هی چ نەتەوەیەکن، بۆیە بە ئاسانی دەزانین کامە (بەیت) هی کامە نەتەوەیە، بۆ نموونە (بەیت)ی ئەوڕەحمان پاشای بابان، قارەمانەکەی ئەوڕەحمان پاشای بابانە کوردەو مێژووی ژیان و فەرمانڕەوایەتییەکەی لە ڕیزبەندی میرانی بابانەوە دیارە، نووسەرەکەشی (عەلی بەردەشانی)یە، دیارە کوردەو خەڵکی کوردستانە، داب و نەریتی نێو بەیتەکە هی کوردانن، لەبەر ئەوە بەیتێکی نەتەوەییە.

٢ـ لە ڕووی زەمەنی نووسینەوە (بەیت) بۆ ڕۆژگاری بەر لە سەرهەڵدانی ئەدەبیاتی کلاسیزمی بەرز دەگەڕێتەوە، چونکە کە کورد پەنای بۆ ئەدەبیاتی کلاسیزم بردو چووە ناو سیستمی عەرووز بۆ نووسینەوەی بەرهەمەکانی، ئیدی داستان سەری هەڵدا، کە داستان مۆدەیەکی پێشکەوتووترە، لە (بەیت)، بەڵام ئەوەش دیسانەوە ئەوە ناگەیەنێت، کە بە سەرهەڵدانی داستان (بەیت) باوی نووسینی نەما بێت، چونکە دوای ئەوەی مۆدەی داستانیش بە سەرهەڵدانی چاپەمەنی بەسەرچوو و ڕۆمان شوێنی گرتەوە، کە هونەرێکی پێشکەوتووترە، بەڵام دیسانەوە ئاساییە تەنانەت ئەمڕۆش داستانێك، یان (بەیت)ێك بنووسرێت، چونکە ئەوە پەیوەندی بە سەلیقەی ئودەبای میللی و ئەدیبانی ترەوە هەیە، کە خۆیان بە کۆنەکە دەبەستنەوەو چەشەی لێ وەردەگرن.

٣ـ بەیتەکانی ئەدەبی میللی دەشێت نووسرابنەوەو، دەشێت لەبەر گوترابن، بە تایبەت لە کۆندا کە نووسین وەکو ئەمڕۆ نەبووە، بۆیە دەبینین بۆ نموونە بەیتی ئەوڕەحمان پاشای بابان زیاتر لە گێڕانەوەیەکی هەیە، خەج و سیامەند زیاتر لە گێڕانەوەیەکی هەیە، لەیل و مەجنون زیاتر لە گێڕانەوەیەکی هەیە، زەمبیلفرۆش زیاتر لە گێڕانەوەیەکی هەیە، هەر گێڕانەوەیەکیش لە دەربڕینەکانی لەگەڵ ئەوی تر جیایە، بەڵام لە هێڵی گشتیدا هەموو گێڕانەوەکانی هەر دەقێك هەر هەمان شتن، هۆی ئەو جیاییەش دیارە نەنووسرانەوەی بووە لە سەردەمی خۆی، دەنا ئەگەر بنووسرابوونایەوە، ئەوە دەقیان دەگرت و کەس نەدەهات زیاد و کەمی لێ بکات، ئەوە

چ جای هەندێ بەیتی وەکو مەم و زین و شیرین و فەرهاد و لەیل و مەجنون و...هتد، بە شێوەی داستانی گەورەش هەر نووسراون.

٤ـ سەرچاوەی (بەیت)ەکان ڕووداوە واقیعییەکانن، ئەمانە بە خەیاڵ و سۆزێکی جوانەوە تێکهەڵکێش کراون بە سەرچاوەکانی دیکەی وەکو ئاین و مێژوو و سروشت و داب و نەریت و...هتدەوە، لەبەر ئەوەشە ڕووداوێك کە بە گەورەیی ڕووی داوە، بە ناوچەکاندا بڵاوبۆتەوەو لە هەر ناوچەیەك شایەرێکی باشی لێ بووبێت، بە سەلیقەو وەستایەتی خۆی ڕووداوەکەی لە قالبی (بەیت)ێك بەرجەستە کردووە، کە ئەوەش هۆکارێکی دیکەیە بۆ بوونی زیاتر لە دەقێك بۆ تەنها یەك (بەیت).

## بەشی دووەم
## تیۆرییەکانی هۆنینەوەی بەیت

**یەکەم: لە ڕووی ناوەڕۆکەوە**

لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لە ئەدەبیاتی میللی کوردیدا بەیت بۆ سێ مەبەست دەهۆنرێتەوە، ئەوانیش:

١ ـ بەیتی قارەمانی: واتە ئەو بەیتەی ناوەڕۆکەکەی شەڕوشۆڕەو تیایدا قارەمانی سەرەکی سەرکەوتن بەدەست دێنێت، لە کۆتایی ئەوجۆرە بەیتانە ژیان بەردەوامەو قارەمان نامرێت، هێشتا لە ژیاندایە، کە ئەو جۆرە بەیتەی (قارەمانی)ش دەکرێتە دووبەش:

یەکەم: بەیتی قارەمانی ئاینی: بۆ نموونە: بەیتەکانی (فەتحی قەلأی خەیبەر)، (غەزای بەدرو حونەین)، (بەیتێ سیسەبانێ)، .. هەموو ئەو بەیتانە بەیتی قارەمانی ئاینینە، تیایدا موسڵمانان قارەمانی ئەو (بەیت)انەن و نەبەردییەکانیان تۆمار دەکرێت.

دووەم: بەیتی قارەمانی نەتەوەیی: بۆ نموونە وەکو بەیتەکانی: (ڕۆستەمی زاڵ)، (قەلأی دمدم).. بەیتی قارەمانی نەتەوەیینە، هەمووی شەڕنامەنەو هەمیشە تیایاندا قارەمان سەرکەوتن بەدەست دێنن تا دەگەنە ئەوپەڕی لووتکەی سەرکەوتن.

٢ـ بەیتی ئەڤینی: ئەو بەیتانە هەمیشە کۆتاییان بە تراژیدیا دێت، وەکو بەیتەکانی: (شیرین و فەرهاد)، (لەیل و مەجنون)، (خەج و سیامەند)و...هتد، کە

هەمیشە قارەمانەکان تیایاندا ناگەنە مەبەست و بە کۆتاییەکی جەرگبڕ ئەو بەیتانە بە کۆتا دێن.

٣ـ بەیتی کۆمەڵایەتی: بۆ نموونە وەکو بەیتەکانی (زەنبیل فرۆش) و (حیکایەتی چل تووتی)، کە یەکەمیان، واتە: بەیتی زەنبیل فرۆش: باس لە بارێکی سۆزئامێز و خۆشەویستی شێتانەی تاك جەمسەر دەکات بۆ چەشەوەرگرتنێکی کاتی لە بەرانبەر، کە ئەمە خۆی لە عەشق بوونی خاتوونی پاشا بەرجەستە دەکات بەو کوڕە هەژارە قۆزەی خەریکی زەمبیل فرۆشتنە، ئەوەش بارێکی کۆمەڵایەتی بەرجەستە دەکات.

دووەمیشیان واتە: بەیتی چل تووتی: بەیتێکی کۆمەڵایەتییە، قارەمانەکەی (خواجە خواداد) کەسێکی دەوڵەمەندە بڕیار دەدات ژن نەهێنێت، بەڵام خەڵکی وازی لێ ناهێنن و ئەوەی دەیبینێت، پێی دەڵێت: نابێت تۆ بە تەنیا لە داب و نەریتی ئێمە جیاببیەوە دەبێت تۆش ژن بێنی، سەرەڕای ئەوەش ڕۆژێکیان کە خواجە لە ماڵ دادەنیشێ پیرەژنێکی لێ پەیدا دەبێت، ئەو پیرەژنە وەکو خەڵکانی دی داوای لێ دەکات ژن بێنێ، دوای بینەوبەردەیەکی زۆر بە هەندێ قسەی خۆش و کاریگەر دڵی خواجە نەرم دەکات و ڕازی دەکات بەوەی ژن بێنێت، ئیتر خواجە ئەو کچە دێنێت کە پیرەژن بۆی دەدۆزێتەوە، بەڵام دواتر وەك ئەوەی خواجە لێی دەترسا خراپتری بەسەردێت، ئەم بەیتە هەمووی لەسەر (فڕوفێڵی ژنان)ە، بەیتێکی کۆمەڵایەتی بەهێزە گەلێك وانەی بەسوودی تیایە.

**دووەم: لە ڕووی داڕشتنەوە**

لە ڕووی هۆنینەوەو داڕشتنەوە بەیت لە ئەدەبیاتی میللی کوردیدا پەیڕەوی لە کۆمەڵێك تیۆر دەکات، گرنگترینیان لەم خاڵانەی خوارەوە کورت دەکەینەوە:

١ـ لە سەرەتای هۆنینەوەدا دەستپێکردن بە ناوی خواوە دەبێت، بۆ نموونە:

(بەیت)ی (ئەوڕەحمان پاشای بابان) سەرەتا بەم شێوەیە بە ناوی خوای گەورەوە دەستی پێکردووە:

**ـ خالق هەر ئەتۆم قادری**

**ڕەببی هەر ئەتۆم قادر**

**بێ خواردن و خۆف و فکری**

**تۆم ئەرزو ئاسمان ڕاگر.**[٩]

بەیتی (ڕۆستەم و برزۆ) بەم سەرەتایە دەستی پێکردووە:

- ئەووەل جار بە ناو پادشای کەریم

بە بسم الله الرحمن الرحیم

بنازم بە سونع زاتی بێ چوونت

بە سنعات کردنی (کون فەیەکونت).[١٠]

(بەیت)ی (قۆچ عوسمان) وەها دەست پێدەکات:

- بە خالقی بەرقەرارە

بە وەی ڕۆی نابوو ڕۆژگارە

قۆچ عوسمان پیاوێك بوو ڕووت و

قووت و لەوی دە بێکارە.[١١]

بەیتی (شیرین و فەرهاد)یش یەك لە گێڕانەوەکانی بەم شێوەیە دەستی پێکردووە:

- بە ناوی خودای بێ شەریك و تاك

سانعی خەڵق و زەمین و ئەفلاك

بێکەس بێشەریك بێ جێگەو مەکان

ڕازقی موتڵەق ڕەحمەت فراوان.[١٢]

بەیتی (لەیلێ و مەجنون)ی (مەلا فەرەج)یش بەم شێوەیە دەستی پێکردووە:

- حەمدو شوکرانە سەنای بێ عەدەد

بۆ زاتی پاکی خالقی ئەحەد.[١٣]

بەیتی (چل تووتی)ش بەم سەرەتایە دەستی پێکردووە:

- بسم الله ئەڵێم بە زمانی فەسیح

**پاشان ئەڵێم بەشێوەی مەلیح**
**ئەلحەمدو لیڵلا ڕەببولعالەمین**
**هەتا بمێنم لەسەر ڕووی زەمین.**(١٤)

بەیتی (فەتحی قەڵای خەیبەر) وەها دەستی پێکردووە:
**ـ ئەووەل بە نامی زاتی خواوەند**
**قەییومی قادر بێ میسل و مانەند**
**بێ شوبە و میسال بێ خوردو بێ خەو**
**ڕوح زەڕڕەییێکە لە ئەلتافی ئەو.**(١٥)

(بەیتی (غەزای بەدر و حونەین) وەها دەست پێدەکات:
**ـ بە ناوی خودای خالقی کەونەین**
**ئەنووسم باسی بەدر و هەم حونەین.**(١٦)

هەرچی بەیتی (شێرۆی قارەمان)یشە، کە ڕەنگبێ نوێترین بەیتی میللی بێت، بەم سەرەتایە دەستی پێکردووە:
**ـ بە ناوی خوای بە تەنێ**
**کە گشت پەنای دەبەنێ**
**خوای گەورەو بچووکان**
**خوای ئینسان و ئەجندان**
**خوای خولقێنەری مە**
**ڕۆزیدەری ژینی مە**
**ئەو نەبووا ئێمە چی بووین**
**لە کوێوە پەیدا دەبووین.**(١٧)

هۆی چوونە ناو باسیش بە ناوی خودا، دیارە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە شاعیرانی (بەیت)نووسی ئەدەبی کوردی، کەسانی موسڵمان و دەرچووانی خوێندنی شەرعی (حوجرە)کانن، یان هیچ نەبێ مەعریفەیەکی دینییان هەیە، بۆیە لای ئەوانیش وەك هەر موسڵمانێکی دیکە، دەستکردن بە هەر کارێك بە بێ ناوهێنانی خودا، کارەکە بێ پێز و نرخ دەکات و نابێتە کارێکی تەواو و نایاب، چونکە بە ناو هێنانی خودا بەرەکەتی خودایی دەڕژێتە نێو تواناکانی شاعیر و بەمە خەیاڵی دەوڵەمەند دەبێت و شتی جوان و جوانتری بۆ دێت، بەڵام بە پێچەوانەوە دیارە کارەکەی ناتەواو دەبێت، بینای ئەو بیروڕایەش لەسەر بڕواهێنان بەو فەرموودەیەدا دامەزراوە، کە تیایدا پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خوای لەسەر) ئەو ڕاستییە لە موسڵمانان دەگەینێت و دەفەرمووێت: ((کل کلام أو أمر ذي بال لا يفتح بذكر الله عز و جل فهو أبتر أو قال أقتع)).[18]

جا لە سۆنگەی ئەو ڕاستییەوە دەربڕینیش وەك هەر کارێکی تر بە ناوی خواوە دەست پێدەکرێت.

٢ـ دوای دەستکردن بە ناوی خوا، شاعیر درووودو سڵاو دەبارێنتە سەر گیانی پێغەمبەر (درووودو سڵاوی خوای لەسەر)، بۆ نموونە:

ـ سەڵات و سەلام بێ حەددو حیساب
لەسەر محەمەد هەم ئال و ئەسحاب[19]

ـ ئەزەل تا ئەبەد سەلامی خودا
لەسەر مستەفا فەخری ئەنبیا
خەیاڵم وایە عەزمم جەزم کەم
باسی مەجنون و لەیلێ نەزم کەم[20]

ـ ڕجای ڕژانی ڕەحمەتی بێ حەد

**ئەکەم لە دەرگای واحیدول ئەحەد**
**بۆ سەر محەمەد فەخری کائینات**
**لەگەڵ ئالوبەیت دائیمولئەوقات**[٢١]

**ـ سەدو بیست و چوار هەزار پێغەمبەر**
**لە نەسلی ئادەم پەیدابوون یەکسەر**
**خصوص محەمەد شای بوڕاق سوار**
**سەرداری هەموو گوزیدەو سوار**
**ئەفزەل و ئەشرەف هەموو مەخلوقات**
**هەم سوپاسالار ڕۆژی عەرەصات**[٢٢]

خاوەنی (ڕۆستەم و برزۆ) لە کۆتاییشدا دیسان داوای بارانی سڵاو و ڕەحمەت بۆ سەر گیانی پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لێ بێت) دەکات:

**ـ بە قەدەر حەرفی تەواوی کتێب**
**سەڵاوات بە ڕووی حەزرەتی حەبیب**[٢٣]

**ـ سەڵات و سەلام دروودی بێ حەد**
**بۆ ڕووحی نەبی یەعنی موحەممەد**
**ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لا یەنام**
**بۆ خولەفاو و سەحابەی کیرام**[٢٤]
**ـ سڵاو لە تۆ ئەی خاتەم**
**گەورەی ئەولادی ئادەم**
**فەخری ئینسان و پەری**
**هەر بۆ خۆتە سەروەری**

تۆ دڵسۆزی بۆ هەمووان

بۆ گیاندار و بۆ بێ گیان

لە ناوت برد کۆیلەیی

یەك بڵند بی و یەك نەوی[٢٥]

٣ـ شاعیر دوای ئەو پێشەکییانەی سەروو داوای سەرکەوتن لە خودا دەکات، بۆ ئەوەی یارمەتی بدات و لە هۆنینەوەی بەرهەمەکەی سەرکەوتووی بکات، بۆ نموونە:
(عەلی بەردەشانی) لە ((بەیت)ی (ئەورەحمان پاشای بابان)دا ڕووی لە خوا کردووەو دوعای کردووە سەری بخات بۆ ئەوەی بتوانێت بەیتێکی بەهێز بهۆنێتەوە، ئەوەتا دەڵێت:

ـ تاق و تەنیا تەن سوبحانی

تۆفیق دەری موستەعانی

خالّق و حاکمی هەمووانی

چاك و خراپ خۆت دەزانی

ئەزم عەلی بەردەشانی

لەنگم نەکەی لە زوبانی

(بەیت)ی دەڵێم بە ڕەوانی

مەدحی پاشای کوردستانی[٢٦]

ژاژلەیی لە بەیتی (فەتحی قەڵای خەیبەر)دا بەم شێوەیە دوعای یارمەتی وەرگرتن و سەرکەوتن لە کارەکەی خۆی دەکات:

ـ بە تەوفیقی تۆ خوای بانی سەر

داستانێ ئەڵێم لە فەتحی خەیبەر

بۆ فەتحی خەیبەر ئەکەم دەست و برد

داوام لێ ئەکەن ڕەفیقانی کورد

**خواوەندی گەورە تەوفیق بدە پێم**
**تا برادەران عاجز نەبن لێم** [٢٧]

خاوەنی بەیتی (ڕۆستەمێ زال) وەها داوای یارمەتی دەکات:

**ـ بدە تەوفیقم یا خالقی بێ نەزیر**
**بنڤیسم بەحسێ شەڕێ جیهانگیر**
**دگەل ڕۆستەمێ جان پەهلەوان**
**دا بێتە گۆتن حەتا ئاخر زەمان** [٢٨]

خاوەنی بەیتی (ڕۆستەم و برزۆ) بەم شێوەیە دوعای سەرکەوتن بۆ کارەکەی دەکات، کە خودا لوتفی لەگەڵ بکات و کۆمەکیی بکات، دەنا ئەو لە کارەکەیدا دەستەوسان دەمێنێتەوە:

**ـ ئومێدم نییە غەیری لوتفی توو**
**دەبێ زاهیر بێ فەرقی من و توو** [٢٩]

(مەلا عەبدی)ش لە بەیتی (شێرۆی قارەمان) بۆ سەرکەوتنی لە هۆنینەوەی بەیتەکەی بەم شێوەیە دوعا دەکات و دەڵێت:

**ـ بەڵێ ئەی خودای تاکم**
**خۆت دەست بگری بە باڵم**
**ڕووی هاوارم لە تۆیە**
**دڵ بێ تۆ ڕەنجەڕۆیە**
**بێ تۆ چیم لە دەست نایە**
**کارم چاکی بۆ نایە**
**بۆیە خۆت کۆمەکم کە**

**لەو کارەم سەرکەوتووم کە**[٣٠]

٤ـ بەیت چ تراژیدی بێت و چ کۆمێدی مادام قارەمانی یان ئەڤینی بێت، دوو قارەمانی هەیە، لە بەیتی قارەمانیدا قارەمانی سەرەکی ئەو سەرکردەیە، کە بەیتبێژ پیای هەڵدەدا، قارەمانی دووەمیش ئەوەیانە، کە دوژمنی قارەمانی سەرەکییە، لەو بارەشدا بەیتبێژ هەمیشە سیفەتە جوانەکان و بەهێزەکان دەداتە قارەمانی یەکەم و سیفەتە قێزەون و لاواز و خراپەکانیش دەداتە قارەمانی دووەم، بۆ نموونە:

عەلی بەردەشانی لە وەسفی (ئەوڕەحمان پاشای بابان)ی قارەمانی بەیتەکەیدا دەڵێت:

**ـ پادشای بابان جیهانگیری**
**ڕەنگ ڕۆستەمی زاڵی پیری**
**ڕانابوێرم بە فەقیری**
**ناکەم خزمەتی وەزیری**
**نانی دەستینم بە شیری.**[٣١]

خاوەنی بەیتی (شێرۆی قارەمان)یش وەها وەسفی (شێرۆ)ی قارەمانی خۆشەویستی نێو بەیتەکەی دەکات:

**ـ شێرۆی خوێندەواری ژیر**
**ئاقڵی بە بڕواو بیر**
**خەمی لە گوندەکەی خوارد**
**چی بکات؟ چۆن ڕزگاری کات**
**زانی خۆشەویستییە**
**هۆی یەکییەتی گوندییە**
**مادام ئەوە نەماوە**
**ڕق لە جێیدا هەڵداوە**

بۆیە گوند دەستە دەستەن
سووك و ڕیسواو بە كێشەن
ئاغاش لەوە بێدەنگە
بۆ وی ئەوە گرنگە
بە پلان و نەخشەی وردی
كەوتە چاكسازی گوندی(٣٢)

بەڵام قارەمانی دووەم، كە لە ڕاستیدا دژە قارەمانی سەرەكی (بەیت)ە، هەمیشە قێزەون و ناشرین پیشان دەدرێت، ئەوەتا (مەلا عەبدی) لە وەسفی (ئاغا)ی دوژمنی (شێرۆ)ی قارەمانی سەرەكی (بەیت)ەكەی، دەنووسێت:

ئاغای دڵتەنگی تووڕە
گوتی: فلتە فلت كەرە
ژن چییە؟! من بە قسەی كەم
ئەوە مابوو، تۆش بڵێی هەم!
ئەو گوندی لێمان تێكدا
ئێوەش وان لە گوێی گادا
من و باب و باپیرم
وەكو دێتەوە بیرم
چەندانی وەكو شێرۆ
كە دەركەت وان سەرەڕۆ
لەگەڵ یەك زەبری دەستمان
كوژران زۆر سووك و ئاسان
ئێستا شێرۆ هەڵبكەوێ
وا بكا خەڵك لێم بژنەوێ
خۆزگە زوو بمكوشتایە

**نەدەبووە ئەو بەڵایە**
**بەڵام ئێستاش ئاسانە**
**شمشێرەکەم دەرمانە(٣٣)**

بەڵام ئەگەر بەیتەکە ئەڤینی بوو، ئەوا دوو قارەمانەکانی هەردوو کیان خۆشەویستن، بەیتبێژ سیفاتی جوان و پڕ لە خۆشەویستی بە هەردووکیان دەدات، جگە لەوانەش کەسایەتی لاوەکی چ لە بەیتی قارەمانی و چ لە بەیتی ئەڤینیش زۆرن، ئەوانیش هەریەکە بە پێی ڕۆڵیان لە نێو بەیتەکەدا سیفەت وەردەگرن.

**٥- چوونە ناو باس:**

چوونە ناو باس بە یەکێ لەو شێوانەی خوارەو دەبێ:

**- وەها باس ئەکەن لە هیندستانا**
**تاجرێ بووە مەردی زەمانە**
**ماڵ و دەوڵەتی حیساب نەکراوە**
**بە خواجە خواداد ناوی نراوە**
**تەرکی هێنانی ژنی کردبوو**
**لە ماڵ و منداڵ خۆی دوور کردبوو**
**وایان پێ ئەوت هەرچی ئەیبینی**
**تۆش وەکو ئێمە ئەبێ ژن بێنی(٣٤)**

**- یارانی مەجلیس گوێ بگرن زۆر جوان**
**بەحسی ڕابردوو بۆتان کەم بەیان**
**هەر ئەبێ خەیاڵ بۆ ڕابردوو کەین**
**نابێ تەماشای ڕووی ڕووبەڕوو کەین**

وەختی ئەفراسیاب شاهی تاجدار
شکا بە دەستی ڕۆستەمی سالار
گەڕایە دواوە لە شەڕی بێژەن
دەرچوو پەرێشان لە دەست پیلەتەن[٣٥]

- وایان نووسیوە مەردانی هونەر
داستانی فەتحی قەڵایی خەیبەر
ڕۆژێك محەممەد سوڵتانی کەونەین
فەخری کائینات جەددولحەسەنەین
لە دوای جەماعەت دانیشت لە میحراب
بۆ ذیکر و تەوحید لەگەڵ چەند صەحاب
پەیابوو قاصید خواوەندی جەلیل
بۆلای محەممەد یەعنی جوبڕەئیل
وتی ئەلسسەلام ئەی ڕێنیشاندەر
پێشەوای جەمیع زومڕەی پێغەمبەر
خودای بێ مەکان لێت ئەکا سەلام
ئەمری وەهایە خوای لا یەنام
ئێستا بە ئەمری خواوەندی غەفار
جاڕچی دەنگ بەرز جاڕیدا لە شار
ئەهلی مەدینە لە خاص و لە عام
هەموو کۆوەبی صەحابەی کیڕام
سیلاح بپۆشن مەردانی هونەر
خۆ حازر بکەن بۆ فەتحی خەیبەر[٣٦]

له پاش سەنای زات پادشای غەفور
با بکەم باسی فەرهادی فەغفور[٣٧]

٦ـ له (بەیت)دا هەمیشە بابەتەکان وەکو ئەڵقەیەکی بەیەکگرێدراو بە دوای یەکدا دێـن، هەمیـشە دێـڕی دووەم دێڕەکـەی پێـشە خـۆی و پارچـەی دووەم پارچـەکەی پێشەخۆی تەواو دەکات و بەم شـێوەیە، تـا مەبەسـت بـە تـەواوەتی دەگاتـە خوێنـەر و ناوەڕۆك دەگاتە کۆتایی، بە واتا: لە (بەیت)دا بەیتبێژ شێوازی گێڕانەوە دەگرێتـە بـەر و بەم شێوەیە بەسەرهاتەکە هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی وەکو زنجیرەیەکی بە دوای یـەك گرێدراو پێشکەش دەکات.

٧ــ بـەیت ئەگـەر تراژیـدی بـێ یـان کۆمێـدی، ئـەوا بـە ڕانـاوی کەسـی سـێیەم دەهۆنرێتەوە، بـۆ نموونـە باسـی (زەمبیـل فـرۆش)ە، یـان باسـی (ئـەوڕەحمان پاشـای بابان)ە، یان باسی (ڕۆستەم)ە، یان باسی (مەجنون)ەو بەو شێوەیە.

٨ـ کۆتایی بەیت بە زۆری بە مەرگی پاڵەوان دێت، ئەگەر تراژیدی بـوو، ئەگـەرناش ئەوا قارەمان بە سەرکەوتوویی دەردەچێت، بەڵام لە هەردوو باردا، نووسـەر خـۆی بـاس لـەوە دەکـات، کـە سـەرەنجامی ژیـانی مـرۆڤ هـەر مردنـە، بۆیـە داوا دەکـات خـەڵك لـە خواترس بن و دەست بە ئاینەکەیەوە بگـرن، بـۆ ئـەوەی نەکەونـە داوی شـەیتان و بـەم هۆیـەوە بـەر نـەفرەتی خـوای گـەورە بکـەون، تـا سـەرەنجام نەچـنە دۆزەخ و هـەموو شتێکیان لە دەست نەچێت، بۆ نموونە:

ـ خوا حافیزتان بێ مەجلیسی باس بێ
فکری مەرگ ئەکا هەرکەسێ کەس بێ[٣٨]
ـ هەموو کۆچیان کرد بۆ دنیای فانی
هیچ ڕایان نەبوارد بە شادومانی
بەڵێ مەعلومە دنیای بێ وەفا
نامێنێ تا سەر بۆ شاه و گەدا

گەر لە دونیادا تۆ سلێمان بی
یاخود ڕۆستەمی مازەندەران بی
یا ببی بە شای هەموو ڕووی جیهان
ببیە ئەسکەندەر یا نەوشێروان
ئەبێ شەڕابی ئەجەل بنۆشی
بەرگی کفنی سپی بپۆشی(٣٩)

ـ باقی وەلسەلام تەواوبوو کەلام
سەڵاوات بدەن لە فەخری ئەنام(٤٠)

٩ـ لە هەندێ بەیت داوای لێخۆشبوون و پابەندبوونی زیاتر بە خۆشەویستی خودا دەکرێت، چونکە ڕێگەی سەرکەوتن و بە لیقای خوا شادبوون لە دواماییدا لەمەوە بەرجەستە دەبێت، بۆ نموونە:

ـ فاتحی فەتاح دوولانی مەشهوور
عاشقی بێکەس فەقیر و ڕەنجوور
کردی بە کوردی ئەم شەڕنامەیە
لە هەموو دۆستێ تکای ئەمەیە
داوای بۆ بکەن دوای کتێب خوێندن
لە قاپی خوای بێ میسل و مانەندن
عیشقی زیباد کا دووسەد چەندانە
چونکە هەر عیشقە مایەی ژیانمانە(٤١)

ـ نامەی عەمەلمان سیایە وەك قیر
بە دەس نەفسەوە داماوین زویر

ئەی خاوەن کەرەم خودای بێ هامتا
مەگەر لوتفی تۆ نەجاتمان بدا[٤٢]

ـ بارانی ڕەحمەت داکا بە جاریٚ
لەسەر ڕەوزەکەی نەبی بباریٚ
هەر قەترەیەکی لە ئەو بوو زیاد
بڕژیٚ بۆ ئەسحاب هەم ئال و ئەولاد
(غ و ف و)و هەم حیساب کەن
سەڵاوات بە ڕووی حەزرەتی حەبیب[٤٣]

١٠ـ لە بەیتدا زۆرجار مێژووی دانان و لێبوونەوە لە نووسین، یان گوتنی بەیتەکە دادەنرێت، بۆ نموونە:

ـ وەختی دانانی ئەم حیکایەتە
ساڵی هۆنانی ئەم ڕیوایەتە
١٩٥٥ ساڵ
کرا بە کوردی بۆ لادێ و شار.[٤٤]

ـ هەزار و سێسەد لەگەڵ حەفتاو چوار
نۆسەد و پەنجا و پێنج و یەك هەزار
لە مانگی ڕەجەب بیست و سێ شەوە
شەوی هەڤدەهەم لە خاکە لێوە
تەواوبوو بە یارمەتی خواوە[٤٥]

کەچی زۆربەی (بەیت)ەکانی تریش مێژووی نووسین، یان گوتنیان لە نێو بەیتەکەدا نەهاتووە، کە ئەمەش کەموکوڕییەکە.

١١ـ ئارەقـەی مانـدووبوون لـە بەیتـدا دیـارەو نـاوی بەیتبێـژ لـە سـەرەتا، یـان لـە ناوەڕاست و کۆتایی لە شوێنێکدا دێت، بۆ نموونە:

**ـ ئەزم عەلی بەردەشانی**
**لەنگم نەکەی لە زوبانی**(٤٦)

**ـ لە پاشان ئەڵێ عەبدولڕەحمان ناو**
**(سەلام)ی مەشهوور دانیشتووی (سەراو)**
**دانیشتووی (سەراو) تابیعی ماوەت**
**قەزای شاربازێڕ ئەهلی سەخاوەت**(٤٧)

**ـ فاتحی فەتاح دوولانی مەشهوور**
**عاشقی بێکەس فەقیر و ڕەنجوور**
**کردی بە کوردی ئەم شەڕنامەیە**
**لە هەموو دۆستێ تکای ئەمەیە**
**داوای بۆ بکەن دوای کتێب خوێندن**
**لە قاپی خوای بێ میسل و مانەندن**(٤٨)

**ـ ئەمەوێ باسی خورشیدی خاوەر**
**بە شیعری کوردی بهێنمە دەفتەر**
**لەمەوپێش چونکە مەلا مستەفا**
**کە بە هەورامی کردوویە ئینشا**
**کەم کەس تێئەگەن وا عەلی باپیر**
**بە کوردی پەتی زوو کردی تەحریر**(٤٩)

## سێیەم: لە ڕووی ڕوخسارەوە

لەم ڕووەوە بەیت ڕەچاوی ئەم تیۆرانە دەکات:

١ـ لە ڕووی فۆڕمەوە بەیت بەسەر چەند کۆپلەیەك دابەش دەبێت، ئەو کۆپلانە دەشێت لە ژمارەی لەتە دێڕەکانیان ڕێك بن، بۆ نموونە: دەشێت مەسنەوی بن، یان سێیی، یان چواری، یان پێنجی، یان شەشی، هەروەها دەشێت کۆپلەکان لە ژمارەی لەتە دێڕەکانیان ڕێك نەبن، بەڵکو دابەشبووبنە سەر چەند کۆپلەیەك هەر کۆپلەی ژمارەی لەتە دێڕەکانی دوو، یان سێ یان چوار و یان زیاتریش بن.. بۆ نموونە:

نموونەی بەیتی کۆپلە ڕێك لە ڕووی ژمارەی لەتە دێڕەکانییەوە:

١ـ بەیت هەیە بە مەسنەوی هۆنراوەتەوە، بۆ نموونە:

**ـ شاهێ ئێرانی سفرە نووبەردا**
**کردی پێشوازی ڕۆستەم ب دلێ دا**
**ئیحترامی کرد بۆ ڕۆستەم ژ بۆ شاه**
**شاه زۆر ماچی کرد، ڕوییێ ئیران پەناه**
**شاباشی ڕۆستەم کر زیف و زێڕە**
**دڕ و مرواری یاقووت و گەوهەرە**
**لەشکەرێ ئێرانێ جەماکر غەنیم**
**ل ناڤ خودا تەقسیم کر زێڕ و هەم زیم**
**مەردانێ ئیرانی یەك یەك هەموویان**
**هاتن بۆ خزمەت ڕۆستەم پەهلەوان(٥٠)**

٢ـ بەیت هەیە سێیینە، واتە هەر پارچەیەکی سێ لەتە دێڕە، نموونەی ئەمە بەیتێکی ئاینی (شێخ عەبدولسەلامی بارزانی)یە، تیایدا دەڵێت:

**ـ گوه بدەنە بەحسێ خۆش**

گەلی کەسێ صاحێب گۆش
خودێ نەکەن فەرامۆش

ئەگەر جوان و ئەگەر پیر
کەسێ خودێ بکەت ژ بیر
قیامەتێ دێ بیت زەڕیر

کەسێ خودێ نەناسی
ڕۆن نابیت قەڵبێ قاسی
حاسل نابیت خەڵاصی

خالق یێکە بێ هەڤاڵە
نە مانەندە نە میسالە
نە مردنە نە زەوالە[٥١]

٣ـ بەیت هەیە بە چوارخشتەکی هۆنراوەتەوە، بۆ نموونە:
نموونەی ئەمە بەیتی (سەکەڕاتێ)یە، کە لە سەرەتاوە تا کۆتایی پەیڕەوی لە چوارخشتەکی کردووە، لە کۆتایی هەموو چوارینێکیش (أستغفر الله العظیم) تەرجیع کراوەتەوە، واتە: تەرجیع بەندە، بۆ نموونە:
.. سوبحان ژ تە شاهێ کەریم
تویی خالقێ عەرشی عەزیم
هیڤی دارین یا ڕەحیم
استغفر الله العظیم

توی حاکمیٚ عەرەصاتیٚ
دیٚکەین بەحسیٚ سەکەڕاتیٚ
مە خەلاص ژ موهلەکاتیٚ
استغفر الله العظیم

ئەیا عەبدیٚ نە گوهدارە
بۆچیٚ ناکەی ئیستیغفارە
نەکو بمری گوناهکارە
استغفر الله العظیم[٥٢]

٣ـ بەیت هەیە شەشینە، وەکو بەیتی (کیٚچا)، بۆ نموونە:
دانگ بامەڕنیٚ هەمی ڕەزن
دوو کیٚچیٚت ب دوی من ڕا دبەزن
شاخ پیٚڤە بوون، من گۆت پەزن
نە ئیٚك و دوو نە سیٚنە
ییٚ ب باقا پیٚ مە ڕا تیٚنە
فەقیۆۆ دیٚ دەڤیٚ لیٚ ببیٚنە[٥٣]
ئەم بەیتە پیٚکهاتووە لە دە پارچەی شەشینی.

نموونەی بەیتی کۆپلە ناڕێك لە ڕووی ژمارەی لەتـە دێڕەکانییـەوە، واتـە نموونـەی بەیتی (پارچەیی):
بەیتی ئەوڕەحمان پاشای بابان بەم شێوەیە هۆنراوەتەوە:
ـ خالق هەر ئەتۆم قادری

ڕەببی هەر ئەتۆم قادر
بێ خواردن و خۆف و فکری
تۆم ئەڕزو ئاسمان ڕاگر
* * *

تۆم ئەڕزو ئاسمان ڕاگر
داتنا بەهەشت و ئاگر
چەند ئاسمان و چەند هەور
چەند باران و چەند بەفر
چەند تیپ و سوپاو لەشکر
* * *

پادشای هەشت هەزار کەسی
وەڵڵاهی بێ شك زیاتر
ئەمنیش یەکێك بووم لە وان
خۆم پێ لە هەمووان کەمتر
سەجدەی شوکرم لەسەر بوو
نەت خولْقاندم بە کافر
تۆی ئەووەڵ و تۆی ئاخیر
هەرچی تۆ پێت بێ ئەمر
نەش بی، تۆ دەیکەی حازر
* * *

تاق و تەنیا تەن سوبحانی
تۆفیق دەری موستەعانی
خاڵق و حاکمی هەمووانی

چاك و خراپ خۆت دەزانی

ئەزم عەلی بەردەشانی

لەنگم نەكەی لە زوبانی

بەیتی دەڵێم بە ڕەوانی

مەدحی پاشای كوردستانی

عامیان پاشا، كامیان پاشا

شاهید ڕومین قزڵ پاشا

هەرچەند جاری شیری كێشا

عالەم دەهاتنە تەماشا

مەردە عەبدولڕەحمان پاشا(٥٤)

دەبینین هەر ئەو چوار كۆپلەی سەرەتای بەیتی (ئەوڕەحمان پاشای بابان) هەر كۆپلەی دابەش بۆتە سەر چەند لەتە دێڕێك، هەر یەكەشیان ژمارەكانیان لە ئەوی دیكە جیایە، بۆ نموونە: كۆپلەی یەكەم چوار لەتە دێڕە، دواتر كۆپلەی دووەم بووەتە پێنج لەتە دێڕ و كۆپلەی سێیەم بووەتە نۆ لەتە دێڕ و كۆپلەی چوارەمیش بریتییە لە سێنزە لەتە دێڕ، دوای ئەوەش تا بەیتەكە دەگاتە كۆتایی، هەمیشە لە كۆپلەی ناڕێكدا دەكەوێتە بەرچاو.

جگە لەوەی سەروو، ئەگەر نموونەیەكی تر بخەینە بەرچاو، كە بەیتی (زەمبیل فرۆش)ە، دەبینین ئەویش لە گێڕانەوەكەی (توحفەی مزەفەرییە)دا بەم شێوە پارچەییە نووسراوەتەوە:

ـ حەق دڵ وەرە جارێك بجۆش

جامیٚ جە ئەشقە مەی بنۆش

كین قەزیەتی زەمبیل فرۆش

فەسیح بكەم حیكایەتیٚ

دەست دە كورسی سەناعەتیٚ

ـ ئەو لاوێکی تازە ڕووالْ
تەرکی کرد شاهی و گەنج و مالْ
لە ترسی مەوت، مالْ کرد بەتالْ
خۆی مەشغول کرد بە تاعەتیْ

ـ لاو بەو قسەی بوو خۆشحاڵە
ڕووی کردە مالْ چۆتە حاڵە
هەڵیگرت زەمبیل چی بوو
ڕووی کردە دیوانی میران
یەك لە دوای وی هات بە خواردا:
(لاو.. میر لە تۆی مەتلەب دیدار دا
بۆ خۆت وەرە بکە قیمەتیْ).
ـ لاو بەویْ فێڵەی نەزانی
بیْ ترس و خۆف چوو بۆ خانی
دەربەی دا چەنگ دەرکەوانی
قایم کرا لای دەحشەتیْ

ـ لاو نۆڕی دەربە نەماوە
لێی تەغیربوو ڕەنگ و باوە:
تا بمداتیْ زەحمەتیْ
لاو بانگ دەکا: (میری کوبارە
ئەتو بە منت هەیە چ کارە؟
تا پێك ببیەنم حاجەتیْ).[٥٥]

وەکو بینیمان: لەم گێڕانەوەیەی (زەمبیل فرۆش)دا پارچەی یەکەم (پێنج)ییە دواتر پارچەی (چوار)ی هاتووە، دواتر پارچەی (حەوت)ی، دواتر لە شوێنێکی تردا هاتۆتەوە سەر پارچەی (چوار)ی و لە پاشان پارچەی (شەش)ی بەکارهێناوەو بەم شێوەیە.

بەیتی (حەتەم)یش وەها نووسراوە:

- چ ڕۆژەکا ئەیینی
چ ڕۆژەکا ئەیینی

محەممەد بانگ هەڵدئینت
چ دئینیت بۆ من دئینیت
خۆش نێچیر بۆ من دئینیت
قەصرەك ل بحەشتێ ژ من دستینیت
دیوانا ڤان صەحابا
هەمیا پالداو دەڕابا
کەسێ لێ نەدا جوابا

ئەو عەتەمێ جندییە
دەست دانا ناڤ سەر دەستا
تشت د لەپی دا ڕاوەستا

گۆت دئینم بۆ تە دئینم
خۆش نێچیر بۆتە دئینم
قەصرەك ل بحەشتێ ژ تە دستینم

**دیڤانا وان صەحابا**
**عەجێبی لێگرتییە**
**گۆت یارەبی یا ئیلاهییە**
**ئەو عەتەمێ جندییە**
**چ جار شەڕ نەکرییە**
**عەجەب ئەڤە وەسا پێ چێبییە**[٥٦]

ئەم بەیتە بە پارچەیەکی دوو لەتە دێڕی دەستی پێکردووە، لە پاشان پارچەکانی تر بوونەتە: چوار لەتە دێڕ، سێ لەتە دێڕ، سێ لەتە دێڕ، سێ لەتە دێڕ، حەوت لەتە دێڕ.. لە پاشتریشدا پارچەی وەها هەیە: پێنج لەتە دێڕە، بۆ نموونە:

**دەھ کافر هنارتنێ**
**چوونە لایێ وێ کوڕێ**
**ژ دویر ڤە پرسیار پێ کری**
**ئەی سوبارێ شێت و گوڕی**
**تو پشتا کێ دخوڕی**[٥٧]

پارچەش هەیە شەش لەتە دێڕە، بۆ نموونە:
**غارەك هینای و بری**
**کافر هەمووی قەت کری**
**بەس ئێك ژێ هێلابییە**
**ئەو ژی بۆ خۆ ڕەڤییە**
**شەلێ خۆ پڕ کر ژ گوییە**
**چووڤە نك قرالێیە**[٥٨]

هەشە ١٥ لەتە دێڕە، هەیە نۆ لەتە دێڕە، هەیـە دوانـزە لەتـە دێـڕە، هەیـە حـەوت لەتە دێڕەو بەم شێوەیە، هەمیـشە پارچـەکان ژمـارەی لەتـە دێڕەکانیـان کـەم یـان زۆر دەبێتەوە.

چوارەم: لە ڕووی (کێش)ەوە

(بەیت) بە کێـشی پەنجـە دەنووسـرێتەوە، واتـە بـە یـەك لـەم شـێوانەی خـوارەوە هۆنراوەتەوە:

أـ دە بڕگەیی، بۆ نموونە:

**بسم الله ئەڵێم بە زمانی فەسیح**

**پاشان ئەڵێم بەشێوەی مەلیح**

**ئەلحەمدولیلّلا ڕەببولعالەمین**

**هەتا بمێنم لەسەر ڕووی زەمین**(٥٩)

ب ـ هەشت بڕگەیی، بۆ نموونە بڕوانە (بەیت)ی ئەوڕەحمان پاشای بابان:

**بە شیر نەبی قەت پێك نایە**

**سوێندم خواردووە بە وەڵلّایە**

**ناچمە سەفەری لەحسایە**

**یاغی دەبم لە بەغدایە**(٦٠)

ج ـ حەوت بڕگەیی:

**خوا بمخاتە ئەو زومڕەی**

**تۆ شەفاعەتکەری بۆی**

**دەنا بە هۆی گوناهم**

**سەگی دۆزەخی تارم.**(٦١)

پێنجەم: لە ڕووی زمانەوە

١ـ بەیت لـە ئـەدەبیاتی میللـی کوردیدا بـە زارەکـان نووسـراوەتەوە، بـۆ نموونـە: بەیتـەکانی (فـەتحی قـەڵای خەیبـەر) و (ئـەورەحمان پاشـای بابـان) و (چـل تـووتی) و (شێرۆ).. بە زاری کرمـانجی خـواروو نووسـراون، بەیتـەکانی (سیـسەبانێ) و بەیتـەکانی (زەمبیـل فـرۆش)ی (مورادخـانی بایەزیـدی و فـەقێی تـەیران) و ... بـە زاری کرمـانجی ژووروو نووسراون.

٢ــ لـە ڕووی دەربڕینـەوە (بـەیت) بـە زمـانی زۆرینـەی خـەڵك دەنووسـرێت، بـەڵام خەڵکی ناوچەیەکی تایبەت، یـانیش هـەر زۆرینەیـەکی سـەر بـە زۆربـەی شـێوەزارەکانی زارێکی دیاریکراو، بۆ ئەوەی زۆرترینـی خـەڵك تێـی بگـەن، بۆیـە ڕسـتەو دەربڕینـەکانی بەیت سـادەو ئاسـانن و بـەو شـێوەیەنە، کـە بیـسەری ئاسـایی بـە باشـی تێـی بگـات و چەشەیەکی خۆشی لێ وەربگرێت.

٣ـ ڕستەو دەربڕینـەکان جگـە لـە وشـەو دەربڕینـی کـوردی زۆریـان لـە زمانـەکانی دیکەش وەرگیراون، بە تایبەتی عەرەبی، بە پێچەوانەی داستان کە وشە و دەربڕینـی لـە فارسی و تـورکیش وەردەگرێـت، ئەمـەش بێگومـان لەبـەر جیـاوازی ئاسـتی ڕۆشـنبیری خوێنەری هەریەکەیانەو لەبەر ئەوەیە، کە داستان هی قۆناغێکی پێـشکەوتووتری ژیـاری کۆمەڵگایە.

## ـ ئەنجام

دوای لێکۆڵینەوە لە بنج و بناوانی (بەیت) و جـۆر و تیۆرییـەکانی، ئـەم باسـە بـەو ئەنجامانە گەیشت:

١ـ بەیت هونەرێکی شـیعری خۆماڵییـە، بـە کێـشی پەنجـە دەنووسـرێتەوە، زمـانی دەربڕینـی سـاکارەو نزیکـە لـە تێگەیـشتنی زۆرینـە، لـە داسـتان نزیکـە، بـەڵام لێیـشی جیاوازە، لەبەر ئەو وەسفانەی پێشووی، هی سەردەمی بەر لـە سـەرهەڵدانی ئـەدەبیاتی هونەری بەرزە، زیاتر لە جـۆرێکی هەیـە، وەکـو کۆمەڵایـەتی و **ئـەڤینی** و قارەمـانی، دەکەوێتە خانەی ئەدەبیاتی میللی نەتەوەیی.

٢ـ بەیت هەندێ لـە سـیمای داسـتان لـە خـۆوە دەگـرێ و لـە هەنـدێ ڕووەوە بـەو دەچێت، بەڵام لە گەلێ ڕووەوەش لە یەك جیاوازن.

٣ـ گرنگترین تیۆرییەکانی بەیت لە ڕووی داڕشتنەوە بریتینە لە: (دەسـتپێکردن بـە نـاوی خـوا ـ سـڵاوبارانکردنی پێغەمبـەر (دروود و سـڵاوی خـوای لەسـەر) ــ داوای یارمەتیکردن لە خودا بۆ سەرکەوتن لە هۆنینەوەی بەیتەکە ـ بەیت قارەمانی بێـت، یـان

ئەڤینی دوو قارەمانی هەیە، لە بەیتی قارەمانیدا قارەمانی سەرەکی ئەو سەرکردەیە، کە بەیتبێژ پیای هەڵدەدا، قارەمانی دووەمیش ئەوەیانە، کە دوژمنی قارەمانی سەرەکییە، لەو بارەشدا بەیتبێژ هەمیشە سیفەتە جوانەکان و بەهێزەکان دەداتە قارەمانی یەکەم و سیفەتە قێزەون و لاواز و خراپەکانیش دەداتە قارەمانی دووەم، بەڵام لە بەیتی ئەڤینی هەردوو قارەمان بە سیفاتی جوان وەسف دەکرێن ـ لە (بەیت)دا هەمیشە وەکو ئەڵقەیەکی بەیەکگرێدراو بە دوای یەکدا دێن، هەمیشە دێڕی دووەمی بابەتەکان دێڕەکەی پێشە خۆی و پارچەی دووەم پارچەکەی پێشەخۆی تەواو دەکات ـ بەیت بە ڕاناوی کەسی سێیەم دەهۆنرێتەوە ـ بەیتی تراژیدی کۆتاییەکەی بە مەرگی قارەمان دێت، بەڵام ئەگەر بەیتەکە تراژیدی نەبوو ئەوا قارەمان هەر لە ژیان بەردەوامەو بە کۆتایی بەیتەکە کۆتایی بە ژیانی ئەو نایەت ـ ناوی نووسەر دەخرێتە ناو بەیت ـ ساڵی هۆنینەوە ئاماژەی بۆ دەکرێت ـ لە دوا پەڕەگرافەکانی بەیت دوعای لێخۆشبوون لە خوا دەکرێت.

٤ـ لە ڕووی فۆرمەوە بەیت دابەش دەبتە سەر چەند بەندێك، کە دەشێت بەندەکان لە ژمارەی دێڕەکانیان ڕێك بن، مەسنەوی بن، یان سێیی، یان چواری و...هتد، هەروەها دەشێت بەندەکان لە ژمارەی لەتە دێڕەکانیان ناڕێك بن، واتە هەر بەندێك لە چەند لەتە دێڕێکی ژمارە جیا لە بەندەکانی تر پێك بێت.

٥ـ زمانی بەیت سادە و ساکارە و زمانی قسەکردنی ئاسایی خەڵکە، بە زاری زۆرینە دەنووسرێت نەك بە زمانی ستاندەر.

## ـ پەراوێزەکان

١ـ ئەحمەد ڕەحمانی، دڵۆپێك لە دەریای بەرفراوانی فۆلکلۆری کوردستانی ئێران، گۆڤاری کاروان، ژ: ١٤٥، ئایاری ٢٠٠٠، لا ٧٣.

٢ـ موئەییەد تەیب، بەیتێن کوردی، لە کۆمکرنیٚ: محەمەد عەبدوڵڵا، کتێبی دەزگای سپیرێز، دهۆك، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢، بەرگی دواوە.

٣ـ د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، بەرگی یەکەم، لا ١٦٩.

٤ـ سەرچاوەی پێشوو، لا ١٧٧.

٥ـ د. خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، بەرگی دووەم، لا ١٧٣٦.

٦ــ د. خەزنــەدار، مێــژووی ئــەدەبی کــوردی، چــاپخانەی وەزارەتــی پــەروەردە، هەولێر، بەرگی چوارەم، لا ٥٤٩.

٧ـ کامەران موکری، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، بەشی یەکـەم، چـاپخانەی زانکـۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٤٠٤هیجری/١٩٨٤ز، لا ٦٥.

٨ـ بڕوانە: ئەسعەد عەدۆ، بەیتی ئایشە گـولّ، چـاپخانەی دار آفـاق عربیـة، بەغـدا، ١٩٨٣.

٩ـ محەمەد تۆفیق وردی، (بەیت)ی (ئەوڕەحمان پاشای بابان)، لا ١١.

١٠ـ (ڕۆستەم و بـرزۆ)ی کـوردی، وەرگێڕانـی: شـێخ فـاتح شـێخ فـەتاحی دولانـی، چاپی یەکەم، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٣٧٤ی هیجری، ١٩٥٥ی زاینی، لا ٣.

١١ـ توحفەی مزەفەرییە، بەشی یەکەم، بەغـدا، ١٩٧٥، چـاپخانەی کـۆڕی زانیـاری کورد، لا ١٢٤.

١٢ـ شـیرین و فـەرهاد، چـاپخانەی تیجارییـە، کـەرکوك، ١٣٩١ی هیجـری، ١٩٧١ی زایینی، لا ٢.

١٣ــ لیلــێ و مــەجنون، و: مــەلا فــەرەج، چــاپخانەی مــەعاریف، بەغـدا، ١٣٧٠ی هیجری، ١٩٥١ی زایینی، لا ١١.

١٤ـ حیکایەتی چل تووتی، کـەرکوك، کتێبخانـەی تـەڕەقی، محمـد امـین عەسـری، ١٣٧٦هـ، ١٩٥٦م.لا ٣.

١٥ـ ژاژلەیی، فەتحی قەڵای خەیبەر، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٣٧٣ی هیجری، ١٩٥٤ی زاینی، لا ٣.

١٦ــ مامۆسـتا مـەلا شـەریف ، غـەزای بـەدر و حونـەین، چـاپخانەی تـەڕەقی، کەرکووك، ١٣٧٤ی هیجری، ١٩٥٥ی زاینی، لا ٢.

١٧ــ لێکۆڵینـەوەی: ئیـدریس عەبـدوڵڵا، بـەیتی شـێرۆی قارەمـان، مـەلا عەبـدی، گۆڤاری پەیامی ڕاستی، ژ:٧٧، پایزی ٢٠٠٦، لا ٦٣.

١٨ـ بڕوانە: (مسند امام احمد، الرقم: ٨٠٣٥٥).

١٩ـ شیرین و فەرهاد، لا ٢.

٢٠ـ لیلێ و مەجنون، لا ١١.

٢١ـ حیکایەتی چل تووتی، لا ٣.

٢٢ـ (ڕۆستەم و برزۆ)ی کوردی ، لا ٣.

٢٣ـ سەرچاوەی پێشوو، لا ١٢٣.

٢٤ـ ژاژلەیی، فەتحی قەڵای خەیبەر، لا ٣.

٢٥. (بەیتی شێرۆی قارەمان)، پەیامی ڕاستی، لا ٦٣.

٢٦- (بەیت)ی ئەوڕەحمان پاشای بابان، لا ١٢.

٢٧- ژاژلەیی، فەتحی قەڵای خەیبەر، لا ٣.

٢٨- بەیتێن کوردی، بەیتا ڕۆستەمێ زال، کۆمکرنا: محەمەد عەبدوڵڵا، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢- کتێبی دەزگای سپیرێزی دهۆك، لا ١١٢.

٢٩- (ڕۆستەم و برزۆ)ی کوردی ، لا ٤.

٣٠- بەیتی شێرۆی قارەمان، پەیامی ڕاستی، ٦٣.

٣١- (بەیت)ی ئەوڕەحمان پاشای بابان، لا ١٣.

٣١- بەیتی ئەوڕەحمان پاشای بابان، لا ١٣.

٣٢- بەیتی شێرۆی قارەمان، پەیامی ڕاستی، لا ٦٤.

٣٣، سەرچاوەی پێشوو، لا ٦٦.

٣٤- حیکایەتی چل تووتی لا ٣و٤.

٣٥- (ڕۆستەم و برزۆ)ی کوردی، لا ٤.

٣٦- ژاژلەیی، فەتحی قەڵای خەیبەر، لا ٤.

٣٧- شیرین و فەرهاد، لا ٢.

٣٨- لیلێ و مەجنون، لا ١٣٨.

٣٩- شیرین و فەرهاد، لا ٧٨.

٤٠. حیکایەتی چل تووتی، لا ١١٧.

٤١- (ڕۆستەم و برزۆ)ی کوردی، لا ١٢٣.

٤٢- شیرین و فەرهاد، لا ٨٠.

٤٣- (ڕۆستەم و برزۆ)ی کوردی، لا ١٢٣.

٤٤. حیکایەتی چل تووتی، لا ١١٧.

٤٥- (ڕۆستەم و برزۆ)ی کوردی، لا ١٢٣.

٤٦- بەیتی ئەوڕەحمان پاشای بابان، لا ١٥.

٤٧- حیکایەتی چل تووتی، لا ١١٧.

٤٨- (ڕۆستەم و برزۆ)ی کوردی، لا ١٢٣.

٤٩- عەلی باپیر، خورشید و خاوەری کوردی، چاپی سێیەم، چاپخانەی نەعمان، نەجەف، بەبێ ساڵی چاپ، لا ٢.

٥٠- بەیتێن کوردی، بەیتا ڕۆستەمێ زال، کۆمکرنا: محەمەد عەبدوڵڵا، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢- کتێبی دەزگای سپیرێزی دهۆك، لا ١٧١.

٥١ـ بەیتن کوردی، محمد عبدالله، لا ٩و١٠.

٥٢ـ بەیتێن کوردی، بەیتا سەکەراتیێ، کۆمکرنا: محەمەد عەبدوڵڵا، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢ـ کتێبی دەزگای سپیرێزی دهۆك، لا ٢٢ تا لا ٣٦ـ ئەو بەیتە هی مەلایی باتەییە، بڕوانە: لا ٣٦ی بەیتا سەکەراتیێ، لە کتێبی بەیتێن کوردی.

٥٣ـ بەیتێن کوردی، (حەفسا کوڤلی)، لا ٢٠٤.

٥٤ـ بەیتی ئەوڕەحمان پاشای بابان، لا ١٣.

٥٥ـ توحفەی مزەفەرییە، بەیتی زەمبیل فرۆش، ٣٠٨.

٥٦ـ بەیتێن کوردی کۆمکرنا: محەمەد عەبدوڵڵا.

٥٧ـ سەرچاوەی پێشوو، لا ٦٨.

٥٨ـ سەرچاوەی پێشوو، لا ٦٨و ٦٩.

٥٩ـ حیکایەتی چل تووتی، لا ٣.

٦٠ـ بەیتی ئەوڕەحمان پاشای بابان، لا١٣.

٦١ـ داستانی شێرۆ، لا ٦٣.

# سەرچاوەکان


به زمانی عەرەبی: کتێب:

١ـ بڕوانە: (مسند امام احمد، الرقم: ٨٠٣٥٥).

به زمانی کوردی: کتێب:

٢ـ ئەسعەد عەدۆ، بەیتی ئایشە گوڵ، چاپخانەی دار آفاق عربیة، بەغدا، ١٩٨٣.

٣ـ ئۆسکارمان، توحفەی مزەفەرییە، و: هێمنی موکریانی، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٥، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد.

٤ـ مامۆستا مەلا شەریف ، غەزای بەدر و حونەین، چاپخانەی تەڕەقی، کەرکووك، ١٣٧٤ی هیجری، ١٩٥٥ی زاینی.

٥ـ ژاژلەیی، فەتحی قەڵای خەیبەر، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٣٧٣ی هیجری، ١٩٥٤ی زاینی.

٦ـ کامەران موکری، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، بەشی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٤٠٤هیجری/١٩٨٤ز.

٧ـ عەلی باپیر، خورشید و خاوەری کوردی، چاپی سێیەم، چاپخانەی نەعمان، نەجەف، بەبێ ساڵی چاپ.

٨ـ د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، بەرگی یەکەم، ٢٠٠١.

٩ـ د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، بەرگی دووەم، ٢٠٠٢.

١٠ـ د. خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، بەرگی چوارەم، ٢٠٠٤.

١١ ـ محەمەد تۆفیق وردی، (بەیت)ی (ئەورەحمان پاشای بابان).

١٢ـ بەیتێن کوردی، کۆمکرنا: محەمەد عەبدوڵلا، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢ـ کتێبی دەزگای سپیرێزی دهۆك.

١٣ـ شیرین و فەرهاد، چاپخانەی تیجارپە، کەرکوك، ١٣٩١ی هیجری، ١٩٧١ی زایینی.

١٤ـ (ڕۆستەم و بـرزۆ)ی کوردی، وەرگێڕانی: شێخ فاتح شێخ فەتاحی دولانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٣٧٤ی هیجری، ١٩٥٥ی زاینی.

١٥ـ لیلێ و مەجنون، و: مەلا فەرەج، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٣٧٠ی هیجری، ١٩٥١ی زایینی.

١٦ـ حیکایەتی چل تووتی، کەرکووك، کتێبخانەی تەڕەقی، محمد امین عەسری، ١٣٧٦هـ، ١٩٥٦م.

گۆڤارەکان:

١٧ـ ئەحمەد ڕەحمانی، دڵۆپێك لە دەریای بەرفراوانی فۆلکلۆری کوردستانی ئێران، گۆڤاری کاروان، ژ: ١٤٥، ئایاری ٢٠٠٠.

١٨ـ ئیدریس عەبدوڵلا، (بەیتی شێرۆی قارەمان)ی مەلا عەبدی، گۆڤاری پەیامی ڕاستی، ژ:٧٧، پایزی ٢٠٠٦.

## *ملخص البحث*

# البيت ونظرية تأليف البيت في الأدب الشعبي الكردي

**ادريس عبدالله مصطفى**

ان هذا البحث الموسوم بـ(البيت ونظرية تأليف البيت في الأدب الشعبي الكردي) دراسة نقدية تطبيقية، تعد بمثابة محاولة لتحديد سمات البيت ونظرية تأليفه كأحدى الفنون الأدبية الشعبية في الأدب الكردي، وقد تمخض من البحث نتائج عدة، نوجزها في النقاط التالية:

١ـ البيت هو فن شعري محلي، يكتب بالوزن (السيلابي) القومي، هو فن القرون الماضية قبل ظهور الشعر الفني الرفيع، له انواع عدة مثل البهلواني، والأجتماعي، والغرامي.

٢ـ أهم نظريات البيت من حيث التأليف هي:

ـ الأبتداء باسم الله سبحانه.

ـ ومن ثم ذكر الصلاة والسلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم).

ـ ثم الدعاء والتضرع الى الله كي يسهل مهمة الشاعر ويوفقه في تأليف بيته.

ـ يتكون البيت من شخصيتين رئيسيتين، سواء اكان بهلوانيا او غراميا، ففي البيت البهلواني يصف المؤلف البطل الرئيس ويمدح مواقفه ويضفي عليه الصفات الحميدة التي يتميز بها الأبطال في التأريخ، وأما البطل الثاني هي شخصية رئيسية أخرى الا انه لا تحظى بمدح المؤلف بل يكن مصدر سخريته ولا توصف الا بما يضعف قوتها وشخصيتها، أما الشاعر في البيت الغرامي فيمدح كلتا الشخصيتين الرئيستين فيه، وهما مثلا (شيرين و فرهاد) أو (ليلى و مجنون) وهكذا.

ـ يتمسك البيت في تقديم أجزائه بالسرد القصصي، فما من مشهد الا وهو مكمل للمشهد الذي يليه.

ـ يتحدث البيت بالضمير الغائب وهو ضمير الشخص الثالث.

ـ ينتهي البيت البهلواني أحيانا ببقاء البهلوان (البطل) على قيد الحياة، وأخرى بوفاته بأجله الموقوت، وأن كان البيت غراميا فيكون نهايته مأساوية في جميع الحالات.

ـ يوضع أحيانا اسم مؤلف البيت وتأريخ تأليفه داخل البيت.

ـ في المقطع الأخير يدعو المؤلف الباري عز وجل أن يغفره ويغفر كذلك المستمعين له، وذلك لأن في الأبيات الأخيرة يقول المؤلف ان الموت حق ولا بد للجميع أن يشرب كأس الموت الذي لا يمكن لأحد أن يفر منه.

٤ـ ينقسم البيت من حيث القالب، الى عدة مقاطع، تكون أبياتها احيانا متساوية، فأما أن تكون مثنوية، او ثلاثية الأسطر، او رباعية...الخ، وأحيانا أخرى تكون ابيات مقاطعة غير متساوية.

٥ـ لغة البيت لغة بسيطة سهلة، هي اللغة العامية.

*Abstract*

# Verse and the theory of composing Kurdish verse in Kurdish folk literature

**Idris Abdullah Mustafa**

It is a comparative and applied study endeavouring to define the characterizations of Kurdish verse as a branch of Kurdish folk art and literature.

The study concluded with the following:

1/ Verse (Bayt) is a local poetic art, written in national (silabi) measure of last centuries prior to modern poetry. Pahlawani, social and romantic are various kinds of (Bayt).

2/ The composition of (Bayt)

- It begins by the name of Allah
- Then blessing the prophet (God's blessing and peace be upon him).
- Pray humbly to God
- The verse consists of two major characters, no matter whether it is pahlawani or romantic. The poet mentions the main character of pahlawani verse with respect and honour while he praises the both in romantic verse such as (Shirin and Farhad) or (Layla and Majnoon).
- The (Bayt) verse is a narrative poetry, so each scene is a complement of the preceding.
- The (Bayt) is always composed with the third person pronoun.
- The (Bayt) comes to an end with the death of its main character in pahlawani and in a tragedy in romantic (Bayt).
- The poet ends his poem by asking God for repentance and concedes that every one meets his doom.
- The (Bayt) is of several stanzas, some times with equal verses.
- The language is simple, easily understood, since it is every day spoken language.

# حامیدی قەرەداغیی کێیە؟

## دەستنووسێك و هەندێك زانیاریی مامۆستا و شاعیرێكی نەناسراوی تەكیەیی قەرەداغی

**محەمەد عەلی قەرەداغی**

گەلێ جار گوتوومە و نووسیومە و هەر دەبێ بیشیلێم و بیشینووسم: دۆزینەوە و پشكنینی هەر دەستنووسێكی كۆنمان لاپەڕەیەكی نەزانراو و شاراوەی مێژووی دێرینمان بۆ هەڵدەداتەوە، بەڵكو هەر دەستنووسێكی كۆنمان گەنجینەیەكی گرانبەهای مێژووی زانایان و ناودارانی كوردە و، كۆكردنەوەی ئەو گەنجینانە كۆكردنەوەی كانی و جۆگەلە پەرتەوازەكانە كە سەرچاوەی روونی مێژووی ئەدەب و زانیاریی و زانستی گەلی كورد پێكدێنن. سوپاس بۆ خودا ـ هەر چەند ئەوانەی كە تێداچوون لە ژمارە نایەن و قەوارەیان نازانرێت ـ ئەوەندەمان لەو گەنجینانە لەملا و لەولا ماون پشكێنەر، دوای گەڕان و پشكنین، بە هەناسە ساردیی ناگەڕێتەوە و، ئەوەندەی دەستدەكەوێت ئارەقی ماندوویێتی پێ وشك بكاتەوە.

ئەمجارەیش دەچینە خزمەتی یەكێك لەو گەنجینە بێوێنانە و، چەند دانە مرواریی كەسنەدیوی لێ وەردەگرین، بۆ ئەو ملوانكە گرانبەهایەی دەكرێتە گەردنی بەرزی مێژووی زانایانی كورد.

لە چەند نووسینی پێشوودا باسی ئەوەم نووسیوە كە شاری بەغدا یەكێك بووە لەو شارانەی ساڵەها و ماوەی درێژ ـ ئەگەر بە درێژایی مێژوویەكی زۆر نەبووبێت ـ بەیداخی زانست تیایدا بە شەكاوەیی بە دەست كەڵە مەلای كوردەوە بووە و، تا ئەوان هەبووبن ـ كە هەمیشەیش زۆر بوون ـ كەسی دیكە شیاوی ئەوە نەبووە ناوی ئەوە بەرێت كە بەیداخداری زانست بێ لە پایتەختی زانستدا. ئەم دیاردەیش تا ئەمڕۆ هەر بەردەوامە.

**باسێكی دەستنووسەكە:**

ئەم دەستنووسە چەند دانراوی لە خۆ گرتووە لەوانە:

١ـ له سه‌ره‌تای كتێبه‌كه ـ ده‌ستنووسه‌كه ـ وه دوو نامیلكه هه‌ڵه‌وگێڕاو ته‌جلید كراون:

یه‌كه‌میان: نامیلكه‌یه‌كه له زانستی (البیان ـ الاستعارة)دا و، ئه‌م ته‌واو ده‌بێت بێ ناوی كه‌س و مێژووی نووسینه‌وه‌، دوای ئه‌مه نیو لاپه‌ڕه كه‌متر له بابه‌تی (وضع) نووسراوه.

دووه‌میان: حاشیه به‌سه‌ر فه‌نارییه‌وه‌، ئه‌میش ناوی كه‌سی به‌سه‌ره‌وه نییه.

٢ـ كتێبی ـ یان حاشیه‌ی ـ (میر ابو الفتح)ه له ئادابدا، ئه‌م كتێبه به خه‌تی دوو سێ كه‌س، یان به دوو سێ خه‌تی جیاواز له یه‌ك نووسراوه‌ته‌وه‌، گه‌لێ حاشیه‌ی گه‌لێ مامۆستایانی كوردی به‌سه‌ره‌وه‌یه‌، له‌وانه: محه‌مه‌د حسه‌ینی حه‌ریری، ئیسماعیلی بانه‌یی، ئه‌م ده‌ستنووسه ساڵی ١١٩٠ به خه‌تی ئیسماعیل نووسراوه‌ته‌وه. به‌ڵام نازانم ئه‌م ئیسماعیله و ئیسماعیلی بانه‌یی، كه حاشیه‌ی به‌سه‌ر كتێبه‌كه‌وه هه‌یه‌، یه‌ك كه‌سن یان نا؟

٣ـ ریساله‌یه‌ك له ئادابدا ساڵی ١١٨٥ نووسراوه‌ته‌وه‌، ناوی نووسه‌ره‌وه‌ی به‌سه‌ره‌وه نییه‌، حاشیه‌ی چه‌ند مامۆستای به‌سه‌ره‌وه‌یه.

٤ـ حاشیه‌یه‌ك به‌سه‌ر (میر ابو الفتح)ه‌وه ساڵی ١١٨٦ نووسراوه‌ته‌وه‌، ناوی كه‌سی به‌سه‌ره‌وه نییه‌، حاشیه‌ی چه‌ند مامۆستای به‌سه‌ره‌وه‌یه‌،[٢] له‌وانه (عبدالكریم البرزنجی).

٥ـ (قول احمد) به خه‌تی حه‌یده‌ری قه‌ره‌داغیی نووسراوه‌ته‌وه‌، له كۆتاییه‌وه نووسیویه:

" والحمد لله اولا وآخرا، والصلاة على رسوله محمد الذي كان للحق ناشرا، وعلى آله واصحابه المؤيدين بالمعجزات الباهرات.

قد وقع الفراغ من كتابة هذه الحاشية المنسوبة الى مولانا قول احمد، يوم الاثنين في شهر المحرم الحرام، في يوم سادس عشر، في بلدة بغداد، صانه الله. في مدرسة العادلية، في قرب دار العصر القضا، في سنة ١٢١٥. على يد احقر العباد حيدر النجاري الكردي القرداغي الشافعي. لا اله إلا الله."[٣]

له‌پاڵ ئه‌م نووسینه‌دا مۆری (حامد)ی پێوه‌یه‌، كه دواتر به درێژیی باسی ده‌كه‌ین. له مۆره‌كه‌ی نووسراوه:

"حامد بلطف حق توكل كرد ١٢٢١".

ئەم دانراوەیش حاشیەی گەلێ لە مامۆستایانی کوردی بەسەرەوەیە، لە هەموویان زیاتر عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەری، حەیدەریی. دوای ئەو ئیبراهیمی کوڕی حەیدەری حەیدەریی و، شەرانشیی و، شەوەکیی و، نوورەدین و، عەبدورەحیم و، محێدین و، یوسف الاصم و، عبدالصمد و، عومەری کوڕی ئەحمەد، .... جگە لە ناوی مامۆستاکانی خاوەن حاشیەکان، نووسەرەوە لە هەندێ جێگەدا وردە شتی نووسیوە، تۆمارکردنی هەندێکیان لێرەدا سوودی خۆی دەبەخشێت و، نووسراوەکان بە دەقەکانی خۆیان دەگوێزمەوە ئێرە:

- کاتبه حیدر في وقت شدة الحر. لا اله الا الله.
- کاتبه حیدر في وقت الصبح يوم الجمعة في آخر شهر المحرم الحرام. ١٢١٥.
- نمقه حيدر وقت الظهر في مدرسة العادلية.
- نمقه حيدر في بلدة بغداد حرسه (!) الله من الآفات.
- نمقه حيدر قبل الظهر في مدرسة العادلية.
- حرره في بلدة قرداغ. في شهر شوال، في خزمتي (!) شيخ علي. آه الف آه من فراق اخوان، خصوصا استاذي مولانا ملا محمد امين.

- بەڵام ئەو خەتەی ئەمەی پێ نووسراوە لە خەتی حەیدەری نووسەرەوەی دەستنووسەکە ناچێت.
- آه من وحالاته احرق قلبي بحرارته. وقع الطاعون في الموصل في سبع من ذي الحجة في سنة الف ومأتين واربعة عشر (!) وصار خوفا عظيما بالبغداد. اللهم احرسها بحرمة النبي المختار. وسليمانية بسنة قبل الموصل وقع الطاعون فيه، كاتبه حيدر الكردي.
- كتبه حيدر في مدرسة العادلية.
- نمقه صالح، آه من فراق اخي حقيقة استاذي ملا محمد امين لاجل قراءتي.
- كتبه حيدر وقت الاستواء في الصيف في المدرسة العادلية في قرب دار القضاء.

- كتبه الغريب في مدرسة العادلية قرب دار القضاء.
- كتبه حيدر يوم الثلثاء في شهر الصفر المظفر في بغداد في مدرسة العادلية في خدمة مولانا عبدالله گراوى. آه من الموت وحالاته...
- كتبه حيدر النجاري الكردي الشافعي التكيي. آه من الموت. آه.
- حرره في يوم العيد القربان (!) آه من فراق اخوان في بلدة سليمانية.
- كتبه حيدر يوم الخميس في شهر صفر المظفر في مدرسة العادلية قرب دار القضا التي انشأتها زوجة الوزير سليم العادلين....[٤] الكبير في سنة ١٢١٥.
- آه من فراق اخي استاذي لاجل فهم محل بحث (وتالاوتر !)[٥]
- تدبر. عبدالصمد حرره في سليمانية بعد الفراق كاك فتح الله.
- عمر بن احمد. حرره بعد الظهر في سليمانية. آه من فراق اخوان.
- عمر بن احمد. حرره صالح. من فراق اخوان.
- قد وقع الفراغ من تنميق هذه الحاشية المنسوبة الى الفاضل مولانا عبد (كذا) بن حيدر الماوراني...[٦] الآبادي. وانا الحقير حيدر الكردي القرەداغى الشافعي من اوله الى آخره لا اله الا الله محمد رسول الله.
- عمر بن احمد آه من فراق استاذي مولانا ملا محمد امين لاجل فهم نكتة.[٧] حرره في سليمانية.
- حرره صالح في سليمانية، آه الف آه بعد الف آه من فراق من في قلبي.
- لێرەدا دانراوی (قول احمد) تەواو دەبێت، لەدوا لاپەڕەیدا ـ کە دووبارە بووەتەوە ـ بە مەرەکەبی سوور نووسراوە:
- "ابتدا كردم باين نسخهء نافعهء نادره، روزى چهار شنبه ماه محرم الحرام در بلدهء سليمانيه. از خذمت اولوى مولوى مولانا شيخ عبدالقادر برادر شيخ عبدالصمد القاضي. خداوندى تبارك و تعالى بمقصود خودشان برسانند، واين حقير نيز بمقصود خود برساند، سنه ١٢٢٦(!)[٨].
- مقصود ومطلب اين بنده بغيراز خداوندى عالميان كس نداند،[٩] ونمى خواهم كه آشكارا نمايم مگر پس از رسيدن بمقصود، يا ان مقصود را بدهى."

- دوای ئەمە لاپەڕەیەك شیعری فارسیی نووسراوە دوایی دێمەوە سەری.
- ـ دوای ئەمە ریسالەی ناسراوە بە (محمد امین علی جهة الوحدة) هەر بە خەتی مامۆستا حەیدەری قەرەداغییە.
- ئەم دانراوەیش حاشیەی چەند مامۆستایەکی کوردی بە سەرەوەیە، لەوانە مامۆستا مەلا رەسووڵی شەوەکیی. لەپاڵ پەراوێزەکانیشدا هەندێ وردە شتی نووسیوە ـ دیسان ـ وەك خۆیان دەیان نووسین:
- كما قال ههنا رسول افندي شوكي مد ظله.
- كتبه حيدر في مدرسة پاچەچی.
- كذا مثله قدس سره، وفي حواشي شرح الرسالة الشمسية. رسول افندي الشوكي مد ظله علينا.

لە کۆتایی ئەم کتێبەیشەوە نووسیویە:

"قد وقع الفراغ من تسويد هذه الرسالة المشهورة بين المحصلين، المنسوبة الى مولانا محمد امين، الواقعة على جهة الوحدة الفنارية. على يد احقر العباد، تراب اقدام الطلبة الزمان، حيدر بن استاد سيف الله بن استاد حسين الكردي الشافعي مذهبا، في يوم الثلثاء اول شهر ربيع الاول، في مدرسة الصياغة في خدمة مولانا رسول الشوكي الحريري مد ظله السامي".

هەر لەم لاپەڕەدا لە جێگەیەکیدا دوای حاشیەیەك نووسراوە: (کتبە محمد مرکی ـ مەرگەیی).

دوای ئەمانە سەرەتای نامیلکەیەك دێت کە باسی ئیعتیراض و تەعلیقە لەسەر حەدیثی (كنت كنزا مخفيا فاحببت أن أعرف، فخلقت ....).

بەمە باسێکی کورتی ناوەرۆکی دەستنووسەکە تەواو دەبێت، بەڵام گەلێ شتی دی هەیە دەبێ بگوترێن، لەوانە:

لە شوێنێکیدا حاشیەیەکی بەسەرەوەیە لە کۆتاییەوە نووسراوە: (کتبە الخرپانی) واتە خەرپانەیی ـ کە مەبەست شێخ عەبدوڵلای خەرپانییە ـ نووسیویەتیەوە. جا دەبێ کەی ئەم کتێبە کەوتبێتە دەست شێخ عەبدوڵلا؟ یان هەر بە رێکەوت چاوی پێی

کەوتووە و ئەوەی نووسیوە؟ یان پێوەندیی نێوان مامۆستا حەیدەر و شێخ عەبدوڵلا، کە هەردووکیان تەکیەیین، وای کردووە یەك ببینن و لەسەر کتێبی یەك بنووسن[١٠]؟ یان هەر کتێبەکە ماوەیەك لای شێخ عەبدوڵلا بووە؟ ئەمانە هەر بۆچوونن، چونکە ئەم دەستنووسە گەلێ دەستی دیوە و، ئەملاولای زۆر کردووە. یەکێکی دی لەوانەی دەستنووسەکەی بە کڕین کەوتووەتە لا مەلا سولەیمان ناوێك بووە و، لەم بارەوە لە لاپەڕەیەکی سپیدا بە خەتێکی خۆش نووسراوە:

"قد انتقل بشراء صحيح الى ملك الحقير المذنب الراجي سليمان".

لەسەر لاپەڕەی یەکەمیشی دوو سێ باسی تەلاق و قەرز و شتی وەها نووسراون.

دوای ئەم باسی ناوەرۆکی دەستنووسەکە جارێکی دی و لە روویەکی دییەوە سەرنجی ئەو شتانە دەدەین کە دەکرێ لەم دەستنووسەیان وەربگرین، یەك دوو تێبینی گەلێ بە بایەخ لە دووتوێی دێڕ و لاپەڕەکانەوە دەبینین، لەوانە:

یەکەم: مامۆستا مەلا رەسووڵی شەوەکیی کە لە مەدرەسەی "الصياغة" مامۆستا بووە و، مامۆستا مەلا حەیدەر لە خزمەتیدا خوێندوویەتی کێیە؟ بەپێی گەڕان و ئاگاداریی من ئەمە یەکەمجارە ناوی ئەم مامۆستا لەناو مامۆستای مزگەوتەکانی بەغدادا دێت و، یەکەمجارە دەزانین ئەو مەدرەسە ناودارەی شاری بەغدا خوێندنگای کوردان بووە و، مەلا و فەقێی کورد تیایدا زانستیان بڵاو کردوەتەوە. دوای ئەمەیش کۆمەڵێ پرسیاری دیکە سەرهەڵدەدەن: دەبێ ئەم مامۆستا مەلا رەسووڵە و رەسووڵی سوورچیی یەك کەس بن؟ دەبێ مامۆستامان تا کەی لە بەغدا مابێتەوە و؟ دەبێ وەك زۆربەی مەلایانی دیکەی کورد تا دوا قۆناغی ژیانی هەر لەوێ مابێتەوە و لەوێ کۆچی دوایی کردبێ؟

دەربارەی ئەو پرسیارەی: کە ئایا دەبێ لە تەك مامۆستا رەسووڵی سوورچیدا یەك کەس بن؟ دوای گەڕان بە سەرچاوەکاندا بۆم دەرکەوت دوو مامۆستا مەلا رەسووڵمان هەیە. یەکەمیان مامۆستا مەلا رەسووڵی سوورچیی، ئەم مامۆستا ساڵی ١٠٢٠ك لە ژیاندا بووە و فەقێ بووە و کتێبی نووسیوەتەوە.[١١] دووەمیان مەلا رەسووڵی شەوەلێرەدا باسی دەکەین، ئەم مامۆستا ـ ئێستە ـ ئەوەندەی دەربارەی دەزانین کە ساڵی ١٢١٥ لە

بەغدا لە مەدرەسەی (صیاغە) مامۆستا بووە و دەرزی گوتووەتەوە، ئیتر دوای ئەوە شتێکمان لە دەستدا نییە و دەبێ چاوەڕوان بین بەڵکو ڕۆژانی داهاتوو شتی وایان پێ بێت تارمایی و تەمی ڕێگەی مێژووی ژیانی بڕەوێنێتەوە.

دووەم: مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای گراویی: ئەم مامۆستایش کە مامۆستا مەلا حەیدەر لە خزمەتیدا خوێندوویە و، مامۆستا لەو کاتەدا لە مزگەوتی (عادلیە) بووە کە یەکێك بووە لە مزگەوتە ناسراوەکانی بەغدا و، خێزانی وەزیر لەو سەردەمەدا دروستی کردووە... ئەمیش ئەمە یەکەمجارە ـ من بزانم ـ ناوی لە مێژووی زانایانی کورددا تۆمار دەکرێت و، پێش ئەمە نە لە کوردستاندا و نە لە دەرەوەی کوردستاندا ناوی هاتووە.

ئەم مامۆستایش دووبارە نازانین تاکەی لە بەغدادا ژیاوە و، ئایا هەر لەو مەدرەسەدا بووە یان چووەتە مەدرەسەی دی؟ ئایا گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان یان تاکۆتایی ژیانی لەوێ ژیانی بەسەر بردووە؟

سێیەم: مامۆستا مەلا عەبدولقادری برای مامۆستا شێخ عەبدوصەمەدی قاضیی. ئەم مامۆستایش بەپێی زانینی من تا ئێستە لە سەرچاوەکانی بەردەستماندا ناوی نەهاتووە و مێژووی زانا و ناودارانی کورد ئاگای لێی نییە. ئەم مامۆستا کە برای شێخ عەبدوصەمەد بێت کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردەیە، شێخ عەبدوصەمەدی برای بە (فەضلەدین) ناسراوە و، لە چەند جێگە و سەرچاوە ناوی هاتووە.[١٢]

## حامیدی قەرەداغیی کێیە؟

دوای ئەم گەشتە خێرا کە بەم گەنجینە پڕ گەوهەر و مروارییەدا کردمان دێینەوە لای ناونیشانی سەرەکیی باسەکەمان کە باسی حامیدی شاعیرە.

ئەم مامۆستایش ئەمە یەکەمجارە ـ بەپێی ئاگاداریی من ـ ناوی لە سەرچاوەکانی مێژووی ئەدەب و زانیاریی کورددا هاتبێت. لە دەستنووسەکەیەوە چەند شتێك وەردەگیرێ، لەوانە:

یەکەم: ئەم مامۆستا لە ساڵی ١٢١٥ك دا لە بەغدا بۆ ماوەیەك ـ کە نازانین چەند بووە ـ فەقێ و خوێندکار بووە.

دووەم: ئەم مامۆستا ناوی حەیدەری کوڕی سەیفوڵلای کوڕی حسەین بووە.
سێیەم: لەپاڵ ناوەکەیدا وەك نازناوی خۆی یان هۆز و تیرەکەی ناوێك دەنووسێ بە (النجاري) و (البخاري) دەخوێنرێتەوە، بە دروستیی بۆم دەرنەکەوت کامیانە.
چوارەم: لە گەڵێ جێگەدا لە پاڵ ناوەکەی خۆیدا (قەرەداغیی) دەنووسێ و گومان لەوەدا نییە کە قەرەداغیی بووە. یەك جاریش بە روونیی نووسیویە (تەکیەیی) بەڵام ئەوەم بەلاوە جێگەی قسەیە کە تەکیەییە ناوی (سەیید) یان (شێخ)ی لەپاڵ ناوی خۆی و باوك و باپیریدا نەنووسیوە و، بەڵکو نووسیویە (استاذ)، دەبێ مەبەستی لەم (استاذ)ە وەستا بێت؟ دەبێ ئەم پیاوە لە سەیدەکانی تەکیە نەبێت و لە هۆز و تیرەیەکی دی بێت کە لە تەکیە نیشتەجێ بووبن؟
پێنجەم: لەپاڵ ناوی خۆیدا کە حەیدەرە مۆری داناوە و، مۆرەکەی نازناوی تێدایە و، لەپاڵ ئەو نازناوە و لەژێر ئەو نازناوەدا شیعری فارسیی گوتووە و، لە سەرووی شیعرەکانەوە کە نازناوی (حامد)یان تێدایە نووسیویە (لراقمه) واتە شیعرەکان هی ئەو کەسەن کە نووسیونییەوە.

**لراقمه**

**باز شراب کهنم آرزوست**

**مستی و والەشدنم آرزوست**

**صحبت سمین تن حور وشان**

**بوسه غنچه دهنم آرزوست**

**نیست شبیه لب لعلت عقیق**

**بوسه ازان لب زدەنم آرزوست**

**تاکه نەبینم (نزر!) نزد رقیب**

**روح کشیدن ز تنم آرزوست**

مشك خطادم زده از طرّه ات

رفتن ملك خطنم آرزوست

خلد برین است تمنای غیر

صحبت تو در جهنم آرزوست

گر بزنی تیغ جفا صد هزار

پیش تو قربان شدنم آرزوست

نرگس شهلاست تمنّا همه

دیده نازك بدنم آرزوست

گر بروی پیش نظر لحظه

خاك بسر ریختنم آرزوست

گر تو بیای سر تربتم

گور کفن بر ... نم آرزوست

شاد مبادا دل (حامد) دمی

بی تو اگر من وطنم آرزوست

لراقمه حامد

ای قد سرو عرعری

از من چرا رنجیده ؟

ای گلبن پیغمبری

از من چرا رنجیده ؟

ای دلبر جانانه‌دام

تو شمع من پروانه‌دام

امشب بپا کاشانه‌دام

از چرا رنجیده ؟

دل بی قرار بی سکون

روحم ز تن آمد بیرون

ای دلبر رخ لاله‌گون

از من چرا رنجیده ؟

عاشق شدم از روی تو

بارك شدم چون موی تو

استاده ام در کوی تو

از من چرا رنجیده ؟

بالله که من یار توام

عاشق برخسار توام

عبدم خریدار توام

از من چرا رنجیده ؟

قربان شوم نازك بدن

ای دلبر سیمن ذقن

وی یوسف گل پیرهن

از من چرا رنجیده ؟

روز شبان زاری کنم

خون از دلم جاری کنم

بی تو من این کاری کنم

از من چرا رنجیده ؟

رباعی حامد

جانُ دل دادُم یك بوسه بدی

تو بدی بوسکی ای جان دلم

صد صفا دارد یك بوسك تو

چه بگویم چه نوسیم خجلم

وله فرد

یارب چه‌کنم گر نه شوم همدم یارم

مجنون صفت از وادی و کوه آه برارم

ولە فرد

شب دیجور اگر باشد جمال یار چون حوری

نباشد احتیاج افروختن از شمع کافوری

هرچند زنم نعرە چو بلبل ز بهاران

هرچند کە ریزم ز مژە اشك چو باران

حاصل نشود وصل دل (حامد) مسکین

با خالُ خط زلف و رخ دلبر و یاران

ولە

گر نە بینم هفتە آن نازنین

بگـذرد آهم ز چرخ هفتەمین

لراقمە حامد

گر گـذارم شکر تا روز حشر

با زکات عشر عشراش ناورم

آە از فراق رویت ای نور هردو دیدە

رفتە بعرش رحمن هفت آسمان دریدە

## پەراوێزەکان:

١ـ بۆ نموونە بڕوانە: دانراوێکی گۆرانیزادەی موفتی بەغدا، محەمەد عەلی قەرەداغیی، بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە رێگەی دەستنووسەکانیانەوە، بەرگی چوارەم، ل:١٤٨.

٢ـ لە پەراوێزی ئەم کتێبەوە نامیلکەیەکی مامۆستا مەلا عەبدوڵلای کوڕی حەیدەری ـ حەیدەریی بە خەتێکی وردی جوان نووسراوەتەوە، کۆتایی نامیلکەکە دیاریی نەکراوە.

ئەم نامیلکە یەکێکە لەو بابەتانەی سەردەمی پێشوو لە حوجرەکانی کوردستاندا بە دەرز خوێندراون و دەیان نوسخەیان لە کتێبخانەکاندا هەیە. بڕوانە: لاپەڕە (٢١٩)ی بەرگی شەشەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە رێگەی دەستنووسەکانیانەوە.

٣ـ لەدوای ئەم لاپەڕەوە کە ئەم دەقەی تێدایە لە لاپەڕەیەکی دیکەدا هەمان دەقی بەم شێوە دووپات کردووەتەوە:

".... والحمد لله اولا وآخرا، والصلاة على رسوله محمد الذي كان للحق ناشرا، وعلى آله واصحابه المؤيدين بالمعجزات الباهرة.

ووافق الفراغ من تسويده يوم الاثنين في شهر محرم الحرام، في يوم سادس العشر(!) في المدرسة العادلية، في دار السلام بغداد. على يد خادم الفقراء حيدر الكردي الشافعي في سنة ١٢١٥"

٤ـ لێرەدا دوو وشەم بۆ نەخوێنرایەوە.

٥ـ ئەمەم وەك خۆی روونووس کرد، نەمزانی مەبەستی چییە.

٦ـ لێرەدا وشەیەکم بۆ نەخوێنرایەوە، بەڵام بەپێی ئەوەی لە شوێنەکانی دیدا دەنووسرێت و ئەم بنەماڵە نازناوی کۆنیان وایە دەبێ (حسين آبادی) بێت.

٧ـ ئەم مامۆستا مەلا محەمەد ئەمینە دیارە مامۆستایەکی زیرەك و ورد بووە و، بۆ دۆزینەوەی نوکتەی ورد بیرتیژ بووە. لە چەند جێگەدا هاوار بۆ دووریی و نەبوونی لەکاتی پێویستدا دەکەن و، مامۆستا حەیدەر بە برای حەقیقیی خۆی دادەنێت.

٨ـ لێرەدا مێژووەکە کوژاوەتەوە بە (١٢٢٣)ش دەخوێنرێتەوە.

٩ـ لە پەنای ئەم نووسینەی مامۆستادا نووسینێکی مامۆستا محەمەدی (عیونی) بەرزنجیی شاعیر و خۆشنووسم بیرکەوتەوە، کە ئەویش لە بەغدا فەقێ بووە و، داخ و

ناسۆرێکی سەختی بووە و، نەیویستووە بیدرکێنێ و لەسەر لاپەڕە دەستنووسە نایابەکەی ئاماژەی بۆ کردووە. (بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ... بەرگی دووەم، ل:١٨١ و بەرگی سێیەم، ل: ٢٤١ و، بەرگی حەوتەم کە بە یارمەتیی خودا بەڕێوەیە). شایانی باسە یادگارێکی دیکەی نایابی ئەم مامۆستام دۆزییەوە و، بە رەنج و زەحمەتێکی زۆر توانیم وێنەی بگرمەوە و، وێنەکەیم بە ئەمانەت دا بە خوالێخۆشبوو، مامۆستا شوکور مستەفا، بەڵام دوای کۆچی دوایی مامۆستا شوکور هەواڵی دەستنووسەکەم پرسی کەچی بێ سەر و شوێن بوو. وێنەی دەستنووسەکە بریتییە لە وێنەی دیوانی شاعیری نەناسێنراوی کورد (صاحیب) ــ عەبدوڕەحمان ئاغای دزەیی، کوڕی حەوێز ئاغای، کوڕی حەمزە ئاغای، کوڕی حاجی ئاغای، کوڕی عەبدولقادر ئاغای، کوڕی حاجی ئاغای گەورەی، کوڕی زەینەدینی میر ئاخوڕی سوڵتان مورادی دووەم ـ ئەم دەستنووسەیش بە خەتی مامۆستا (عویوونیی) بەرزنجییە و، ساڵی ١٢٥٧ لە بەغدا نووسیویەتییەوە.

گومانی زۆر بۆ ئەوە دەچێت دەستێك ئەم دەستنووسەی لە کتێبخانەکەی مامۆستا شوکور مستەفا دەرهێنابێت لە تەك هەندێ شتی دیکەدا کە کاتی خۆی مامۆستای خوالێخۆشبوو بۆی باس کردووم، لەوانە گەلێ نامەی تایبەتیی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانیی کە بۆ مامۆستا شوکوری ناردوون و گەلێ شتیان تێدایە.

هیوادارم ئەمانە بگەڕێنەوە کۆڕی زانیاری کوردستان کە شوێنی شیاو و شەرعیی ئەو شتانەن!

١٠ـ شایانی باسە ئەم مامۆستا ـ حەیدەری قەرەداغیی ـ هاوچەرخی مامۆستا شێخ عەبدوڵلای خەرپانیی بووە. (بڕوانە: محمد علي القرداغي، الشيخ عبدالله الخرپاني من خلال مخطوطات مكتبته، مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد الثاني، السنة الثانية).

١١ـ بڕوانە: مێژووی زانایانی کورد، بەرگی: ٦ ل:١٠٩.

١٢ـ بڕوانە: محمد علي القرداغي، محمد فيضي الزهاوي، نبذة عن حياته وشيء من آثاره، الطبعة الاولى، دار آراس للطباعة والنشر، حي خانزاد، اربيل كردستان العراق، ٢٠٠٤، ص:١٣٢.

# ملخص البحث

## من هو حامد القرەداغي؟


محمد على القرداغي




المخطوطات خزين تراثنا، ومصدر المعلومات عن علمائنا ومشاهيرنا، نقف في كثير من الاحيان في مخطوطة واحدة على المعلومات ما لانجدها في عدد من المصادر او لانقف عليها البتة. لم نسمع قبل الوقوف على مخطوطة حامد القرەداغي. ان حامدا القرەداغي كان كاتبا واديبا وشاعرا باللغتين الفارسية والكردية. كما لم نسمع ان هذا الشاعر درس في بغداد فترة غير قصيرة.

وعلمنا من خلال هذه المخطوطة ان علما من اعلام الكرد القدامى الذين ليست لدينا اخبار عنهم تسنم كرسي التدريس في مدرسة الصياغة ـ وتسمى مدرسة الصياغة ـ وهو الملا رسول الشوكي.

كما علمنا من خلال سطور هذه المخطوطة ان عالما كرديا آخر من الذين لانعلم ـ عبر مصادرنا ـ عنه شيئا تسنم وظيفة التدريس في مدرسة جامع العادلية وهو الاستاذ عبدالله الگراوي.

ومن خلال هذه المخطوطة علمنا ـ ايضا ـ ان السيد عبدالصمد القاضي الملقب بفضل الدين كان له اخ عالم تولى منصب التدريس في احدى مدارس السليمانية، ودرس عليه شاعرنا حامد. وهذا العالم اسمه عبدالقادر وهو نجل الشيخ حسن (الگلەزردە)ی.

*Abstract*

## Who is Hamid Al-Qaradagi?

Mohemmed Ali Al-Qaradagi

Manuscripts are the main source of information about our scholars and eminent personalities. Only when I found Hamid's manuscript, I acquainted myself with a writer and a poet of Persian and Kurdish, even we have never heard that he had been in Baghdad, studying for a long time.

Only through this manuscript we now know that an old Kurdish scholar was teaching in Siaga school of Mulla Rasul Al-Shoki and another Kurdish scholar named Abdullah Girawi ascended to teach in Adliya Mosque school and Mr. Samad Al-Qadi (Fadluddin) had a scholar brother taught in various schools in Sulaimania, named Abdul-Qadir Sheikh Hasan Al-Gilezrdayi. He was also our poets teacher.

# هەندێك تێبینی زانستانە لە بابەت نامیلكەی ڕێنووسی كوردی بە ئەلفوبێی لاتینی

د. عەبدوڵلا یاسین ئامێدی

نامیلكەی ناوبراو لەلایەن مامۆستا تانیا ئەسعەد محەمەد ساڵح ئامادەكراوە و لیژنەی باڵای ڕێنووسی كوردی بە ئەلفوبێی لاتینی لە وەزارەتی پەروەردە پێیداچووەتەوە، ئێستا وەكو نامیلكەیەك چاپ كراوە و لەسەر پەیمانگاكانی مەڵبەندی و پێگەیاندنی مامۆستایان بڵاوكراوەتەوە، تا وەك بابەتێك لە قۆناغی یەكەمدا بخوێندرێت. هەر چەندە ئەم هەوڵدانە كارێكی باشە و سەرەتایەكە بۆ فێربوون و خوێندن و نووسینی زمانی كوردی بەو جۆرە تیپانە، بەڵام بەداخەوە هەڵەی ڕێنووسی وای تێدا هەیە، كە دەبێت بە زووترین كات چارەسەر بكرێت، چونكە ڕاست نەكردنەوەی ئەو هەڵانە دەبێتە هۆی ئەوەی، قوتابیان بەو هەڵانە فێری ببن، ئیتر ئەگەر شتیش لە مێشكدا جێگیر بوو، دواتر چارەسەركردنی دژوارە. چەند ئەندامێكی كۆڕی زانیاری كوردستان بە وردی بە نامیلكەكەدا چوونەوە و هێندێك تێبینی بابەتانە و زانستانەیان پێشكێش بە وەزارەت كرد:

## بەرگ

- لەسەر بەرگی كتێبەكە نووسراوە، تانیا ئەسعەد، ناوی باوكی، كە ئەسعەدە بەم شێوەیە بە لاتینی نووسراوە Asēd/ پێویستە ڕاستییەكەی بنووسرێت، كە ئەمەیە/ Es'ed.

## پێشەکی

١ـ ئاماژە بە مێژووی نووسینی کوردی بە تیپی لاتینی کراوە، بەڵام بەداخـەوە ئـەو هـەموو کـار و هەوڵانـە نەخراونەتـە ڕوو، کـە پێشتر لـەنێو کوردسـتان و لـە دەرەوەیـدا کراون، بۆیە سەر پێیی پێوە دیارە و پێویست بـوو مێـژووی بـەکارهێنانی تیپـی لاتینـی بەشێوەیەکی کرۆنۆلۆژی باس کرابا، تا مافی ئەو زانا و شارەزایانەی کاریان لەم بـوارەدا کـردووە پـشت گـوێ نـەخرابا: لەوانـە: عـەرەبی شـەمۆ، مـاراگوولۆڤ، تۆفیـق وەهبـی، جـەلادەت بـەدرخان، لەوانـەی سـەردەمیش: جـەمال نەبـەز، گیـو موکریـانی، عـەزیز ئاکرەیی، محەمەد ئەمین بۆزئەرسەلان و ڕێکێش ئامێدی، شەوکەت سندی و هتد...

٢ـ ناگوترێت: جەنگی جیهانی یەکەم

جەنگی جیهانی دووەم

دەگوترێت: جەنگی یەکەمی جیهانی

جەنگی دووەمی جیهانی

٣ـ پێویستە دەنگی (ژ، ێ، ڵ، ۆ، ڕ)یش بخرێتە پاڵ (پ، چ، ڤ، گ).

## لاپەڕە٣

١ــ لـە هـەموو نامیلکەکـەدا وشـەی (پیـت) بەرامبـەر بـە (حـرف) بـەکارهێنراوە، ڕاستییەکەی (تیپ)ە، ئەم زاراوەیەش لە بنج و بناواندا یۆنانییە.

٢ـ بۆ جوداکردنەوەی هەندێك دەنگی (نەبزوێن) لەگەڵ یەکتریدا، نیشانەی ئەکسنت ( ـ ) بەکارهێنراوە:

X=خ    H=ه

$\bar{X}$=غ    $\bar{H}$=ح

تـا ئێـستە ئـەوەی بـاوە نیـشانەی (٨) خراوەتـە سـەر ئـەو تیپانـە، یـانیش دوو خاڵی(..)ی بۆ دانراوە. بـەکارهێنانی نیشانەی (٨) لـە هـەموویان بـاوترە، چـونکە ئـەم

نیشانەیە دەخرێتـە سـەر هەنـدێ تیپـی (بـزوێنیش) بـۆ جوداکردنیـان لەگـەڵ دەنگێکـی نێزیکی خۆی، هەروەکو لەم تیپانەدا دەردەکەوێت:

| | |
|---|---|
| u=و | û=وو |
| i =Ø | î=ی |
| E=ـە | Ê=ێ |

٣ـ دەربـارەی تیپـی (ع) لـە ئـەلفوبێی لاتینیـدا وێنـەی نییـە، چـونکە ئـەم دەنگـە دەنگێکی ڕەسەنی کوردی و زمانەکانی ئەوروپا نییە. ئەمە ڕاستە، بـەڵام نیـشانەی(,)ی بۆ دانراوە، کە نیشانەیەکی جیهانییە و بەباشـی پـەیڕەو کـراوە. چـونکە ئەگـەر ئاوڕێـك لەناو و ناولێنان لە کوردیدا بدەینەوە، بە دەیان ناوی عـەرەبیمان هـەن جێگـای خۆیـان لەناو زمانی کوردیـدا کردۆتـەوە و دەکرێـت بـەم شـێوەیەی ژێـروو بـە ئـەلفوبێی لاتینـی بنووسرێن:

أ ـ ئەگەر ئەم تیپە لە سەرەتای وشەدا هات، بەم شێوەیە دەنووسرێت:

| | |
|---|---|
| عادل | 'Adil |
| عەلی | 'Elî |
| عەبدوڵلا | 'Ebdulla |
| عوود | 'Ûd |

ب ـ ئەگەر تیپی (ع) لە ناوەڕاستی وشەدا هات:

| | | | |
|---|---|---|---|
| معروف | Me'ruf | مەسعوود | Mes'ûd |
| سەعید | Se'îd | ئیسماعیل | îsma'îl |
| جەعفەر | Ce'fer | ئەسعەد | Es'ed |

پ ـ ئەگەر تیپی (ع) لە کۆتایی وشەدا هات:

| | | | |
|---|---|---|---|
| بدیع= بەدیع | Bedî' | نافع | Nafi' |
| ربیع= ڕەبیع | Rebî' | | |
| سمیع= سەمیع | Semî' | | |

**لاپەڕە٤**

١ـ کاتێ (هەمزە)ی عەرەبی دەکەوێتە پێش هەر هەشت بزوێن لە زمانی کوردیدا لەو بارانەدا، کە لە سەرەتای وشەدا دەبن، وا باشترە ئەم نیشانەیەی: (‘) بۆ دابنرێت، کە لە هەندێ نووسینی لاتینیدا بەرچاو دەکەوێت لە نووسینی ستاندارد بەکارناهێنرێ لە ترانسکریپی عالەمی هەیە:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ئەندام | ‘Endam | ئوردن | ‘Urdin | ئێران | ‘Îran |
| ئادار | ‘Adar | ئۆدە | ‘Oda | ئێوە | ‘Êwe |
| ئنجیل | ‘Incîl | ئوونجە | ‘Unce | | |

جگە لەوەی، کە هەمزە لە سەرەتادا دێت، هەروا لە ناوەڕاست و کۆتایی هەندێك وشەی کوردیدا بەرچاو دەکەوێت، بۆ نموونە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| بجهئینان | Bicih'înan | نەء | Ne' |
| قورئان | Qur'an | تەحەء | Tehe' |
| فوئاد | Fu'ad | چوء | Çe' |

سەرەڕای ئەمەش دەنگی (هەمزە) ئەگەر هاتوو لە کوردیدا لەگەڵ فۆنیمێکی تر لە هەمان شوێن و ژینگەدا گۆڕدرا دەبێتە هۆی گۆڕینی واتای وشەکە، واتە (هەمزە) وەکو فۆنیمێکی سەربەخۆ خۆی پیشان دەدات و ناتواندرێت سەرەدەری لەگەڵدا نەکرێت.

چونکە گرنگی خۆی وەکو فۆنیمێك دەنوێنێت و هیچ جیاوازی لەگەڵ فۆنیمەکانی دی زماندا نییە بۆ سەلماندنی بۆچوونی سەرەوە با تەماشای ئەم نموونانەی ژێروو بکەین:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ئاش | ‘AŞ | ئاڤ | ‘Av | ئەڤین | ‘Evîn |
| ماش | MaŞ | داڤ | Dav | شەڤین | Şevîn |

یان لەم نموونەیەدا:

| | |
|---|---|
| ئێوە | ‘Êwe |
| مێوە | Mêwe |

٢ـ وشەی ئور بە چ واتایەك بەکارهێنراوە؟!

## لاپەڕە ٥

١ـ لە دێری دووەمدا وشەی (خودا ــ Xuda) بە یەگ برگە دانراوە خۆی دوو برگەیە: (Xu/da). هەندێ جار لە شیعردا دەبێتە یەك برگە.

٢ـ هەر لەو لاپەڕەیەدا وشەی (وشە) بە دوو جۆر نووسراوە، کە سەر لە قوتابی دەشێوێنێت، وا باشترە، لە نووسیندا ڕەچاوی ڕێنووسی ئەلفوبێی کوردی - عەرەبی بکرێت، هەروەکو ئێستە لە کتێبەکانی پەروەردەیی و نووسراوەکانی ڕەسمی ئەم وشانە بە یەك (و) دەنووسرێت، بۆ نموونە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| Wişe | وشە | نەك ووشە | Wûşe |
| Wird | ورد | نەك وورد | Wurd |
| Win | ون | نەك وون | Wun |

هەردووکیان ڕاستن یەکەمیان لە بادینان و سۆران بەکاردەهێنرێ، دووەمیان لە سلێمانی و گەرمیان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا یەکەم پەسند دەکرێت و نووسەران پەیڕەوی دەکەن.

٣ـ وشەی (غەم ـ Xem) لە شێوەی (خەم) نووسراوە.

٤ـ وشەی (ڕووناهی) بەم شێوەیە نووسراوە (Runahî) ڕاستییەکەی (Rûnahî)یە.

٥ـ ڕێزمان، بە هەڵە کراوەتە برگە (Rêz/man)، کە خۆی لە ڕێ + زمان پێکهاتووە، Rê/Zi/man.

## لاپەڕە ٨

لەڕووی ئەوەی زۆرینەی کورد یەکیەتی بە یەکێتی Yekyetî گۆ دەکات، وا باشترە بە شێوەی یەکێتی Yekêtî بنووسرێت.

## لاپەڕە ٩

لەم لاپەڕەیە و لە هەندێك لاپەڕەی دیدا لامی گران (ڵ)، کە بە لاتینی نووسراوە، تەنیا شێوەی کەپیتالی دراوەتێ؟! بۆ وێنە وەك XeLk, MaL, HeLwasîn ڕاستییەکەی دەبێ بەم شێوەیە بنووسرێن Xelk, Mal, Helwasîn.

## لاپەڕە ١٠

لەم نامیلکە و لە زۆربەی ئەو نووسینانەی بە لاتینی بڵاودەکرێنەوە ئامرازی پێوەندی (و) بە شێوەی (û) دەنووسرێت، گەر سەرنج لەو وشانە بدەین، کە بە هۆی ئەم ئامرازەوە لێکدەدرێن دەبینین، هەتا ئەو وشە لێکدراوانەی، کە وشەی یەکەمیان بە

دەنگێکی بزوێن کۆتایی دێت و وشەی دووەمیان بە بزوێن دەست پێدەکات، دیسانەوە هەمان شێوەی (û)ی بۆ بەکاردێت، لە ڕاستیدا دەبێت ئامرازەکە لە شێوەی (W)دا بێت، وەک:

دارا و ئازاد Dara w Azad

Da/raw/Az/ad

برا و برازا Bira w biraza

لەگەڵ مەڕ شین دەکا و لەگەڵ گورگ گۆشت دەخوات

Legel mer şîn deka w legel gurg goşt dexwat

بێ ڕەشەبا و بێ دەنگ وەرە

Bê reŞeba w bêdeng were

Bê/ re/şe/baw/ bê/ deng/ we/re

لاپەڕە ١١

١ـ وشەی میحرابی بەم شێوەیە نووسراوە: Mihrabî، دەبێت وا بنووسرێت Mîĥrabî.

٢ـ وشەی پیاوێك بەم شێوەیە نووسراوە Pyawêk

ڕاستییەکەی: Piyawêk

٣ـ وشەی / ڕۆژە / نووسراوە Rojê دەبێت Roje بێت.

٤ـ له هۆنراوەی قوبادی جەلی زادەدا ڕێنووسی نیشتمان لەگەڵ ڕێنووسی لاتینێکە: Nîştîman یەك ناگرنەوە.

٥ـ Zohreیە، یان Zuhre.

**لاپەڕە ١٢**

١ـ وشەی کوردستان بەم شێوەیە نووسراوە Kurdûstan ڕاستییەکەی Kurdistan.

٢ـ لە دێڕی سێیەمی مەشق کردندا وشەی / î l î / زیادە و پێویستە لاببردرێت.

٣ـ دەستەواژەی

Sun/ ne û/ Şî'e وا نووسراوە ڕاستییەکەی Sun/ new/ Şî/'e

٤ـ وشەی زیاتر بەم شێوەیە نووسراوە Zyatir ئەمە هەڵەیە و ڕاستییەکەی Zi/ ya/ tir.

**لاپەڕە١٣**

ڕەزڤانیٚ زەڤیا خۆ .......... هەڵەیە، ڕاستییەکەی:

ڕەزڤانی زەڤیا خۆ ..........

**لاپەڕە ١٤**

١ـ نیشانەی (^) لەسەر (x) لە وشەی Dirêxîyan

ڕاستییەکەی دەبێ نیشانەی بۆ دابنرێت Dirêxîyan

٢ـ نەکردووە بە دوو جۆرە ڕێنووس نووسراوە:

nekirduwe و nekirdûwe یەکەمیان ڕاستە.

**لاپەڕە ١٥**

١ـ ساڵ و دەمساڵ بەم شێوەیە نووسراوە Sal û demsal

ڕاستییەکەی: Sal u demsal

٢ـ وشەی Çiriya بەشێوەی Çirya بنووسرێت باشترە، چونکە کوردی باکوور بەو شێوەیە گۆی دەکەن.

٣ـ وشەی (Pêsîn) هەڵەیە و ڕاستییەکەی e(Pêşîn).

٤ـ واوی عەتف لە لاتینیدا (u)ە (û) نییە و ئەمە هەڵەیە.

## ملخص البحث

# بعض الملاحظات العلمية حول كراس كتابة اللغة الكردية بالحروف اللاتينية

د. عبدالله ياسين ئاميدي

منذ عامٍ تم اعداد كراس حول كيفية كتابة اللغة الكردية بالحروف اللاتينية من قبل المدرسة تانيا اسعد محمد صالح بهدف تدريسه في المراحل الاولى في المعاهد المركزية واعداد المعلمين والمعلمات، حيث قمت ومن خلال هذا البحث بتسليط الضوء على ذلك الكراس وبصدد تصحيح كتابة المفردات الخاطئة التي وردت فيه وكذلك كيفية التعامل مع الارشادات وبعض الحركات والحروف الصامتة والصائتة، مبدياً بعض الملاحظات حولها. بهدف تقديم خدمة مفيدة في هذا المضمار.

*Abstract*

**Some Scintific Remarks about Writing Kurdish Language in Latin Alphabet Manual**

Dr. Abdullah Yasin Amedi

Last year, the teacher Tania Asaad Mohemmed Salih prepared a manual on writing Kurdish in Latin alphabet, supposed to be taught to the students of the first year of teacher's institutions. I shed light on this hand-book in order to correct some mistakes.

I also tried to explain some vowl points, consonants and vowels, in the hope of rendering the students a service.

# ئەلفبێی یەکگرتووی
# کوردی بە تیپی لاتینی

د. بائیز عومەر ئەحمەد

## کورتی

ئەلفبێی هەر میللەتێك لە ژمارەیێکی دیاریکراوی تیپەکان[1] پێك دێت. کەچی ژمارەی تیپەکانی ئەلفبێی لاتینی کوردی لە زمانزانێکەوە بۆ زمانزانێکی تر جیاوازە. ئەمەش بە ڕای ئێمە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیێکی زانستییە، بۆیە بە پێویستمان زانی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەنجام بدەین، کە هەوڵدانێکە بۆ دەستنیشانکردنی تیپەکانی ئەلفبێی لاتینی کوردی بە شێوەیێکی زانستییانە.

## سەرەتا

دەمێکە باسی زمانی یەکگرتووی کوردی دەکرێ و زۆریش لەم بارەوە وتراوە. بەڵام زۆر زۆر کەم لەوە، قسەی زانستی بووە، ئەوەی دی هەموو قسەی سۆزداری بێ بەرهەم.

---

١) تیپ: ئەو ڕەمزە یان شەکلەیە کە بۆ فۆنیم دادەنرێ. فۆنیمیش ئەو دەنگە زمانییانەن کە بەهایان هەیە، واتە لە بیئەیێکی دیاریکراوی زمانێکی دیاریکراودا هەر کە گۆڕان، واتا دەگۆڕێن (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: بائیز عمر احمد ٢: ٩–١٠).

ئێمە چاك دەزانین كە زمانێكی دروستكراو لە چەند دایالێكتێك وەكو (زەلاتە) لە دەرگای زانستدا تێپەڕ نابێ. بەڵام سەرەڕای ئەوەش لە تواناد ا هەیە ئەلفبێیەكی یەكگرتوو و تەنانەت فەرهەنگێكی یەكگرتووش بۆ ئەم دایالێكتانە یان هەر هیچ نەبێ بۆ دوو دایالێكتە سەرەكییەكەی زمانی كوردی (كرمانجی سەروو و خواروو) پەیدا بكرێن.

ئەم لێكۆڵینەوەیە هەوڵدانێكە بۆ پەیداكردنی ئەلفبێیەكی یەكگرتوو بۆ زمانی كوردی لەسەر بنەمای تیپی لاتینی.

لێرەدا دەتوانین بڵێین كە ئەلفبێی لاتینی كوردی تائێستا بە دوو شێوە دانراوە. ئەلفبێی جەلادەت بەدرخان (جەلادەت بەدرخان و روجێ لسكو ٦: ٢٣–٢٤) و ئەلفبێی تەوفیق وەهبی (حامید فەرەج١: ٢٣). ئەوانی دی بریتین لە دەستكاریكردنی ئەم ئەلفبێیانە، بەتایبەتی ئەلفبێیەكەی جەلادەت بەدرخان چونكە ئەلفبێیەكەی تەوفیق وەهبی هەر لە زووێكەوە پەسند نەكراوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە لەسەر بنەمای ئەلفبێی ئینگلیزی دانراوە كە دەنگی وەكو (ش) بۆ نموونە دوو هێمای هەیە بەم جۆرە (sh) كە ئەمەش لەوانەیە بە قورسیان زانیبێ لە ئەلفبێدا، ئێمەش هەر لەبەر ئەم هۆیە، هەوڵ دەدەین بەشێوەیێكی زانستییانە دەستكاری ئەلفبێیەكەی جەلادەت بەدرخان[٢] بكەین.

بۆ ئەم مەبەستەش لێكۆڵینەوەكەمان دابەش كردووە سەر دوو باس، یەكەمیان دەستنیشانكردنی ئەلفبێیەكەی جەلادەت بەدرخانە و ئەو دەستكارییانەی لەسەری كراون، دووەمیان سەر لەنوێ دەستنیشانكردنی ئەلفبێیەكەیە بەشێوەیێكی زانستییانە. لە كۆتاییشدا ئەنجامی لێكۆڵینەوەكە بەشێوەیێكی كورت و پوخت دەخرێتە ڕوو.

---

٢) هەر چەندە حاجی جندیش لەوانەیە لەگەڵ جەلادەت بەدرخان یا پێش ئەویش ئەلفبێیە لاتینییەكەی بڵاوكردەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەلفبێیەكەی جەلادەت وەرگیراوە و بڵاوبووەوە، ئێمەش ئەوەمان بە بناغە دانا بۆ لێكۆڵینەوەكەمان (بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی مێژووی ئەلفبێی لاتینی كوردی بڕوانە: هوگر طاهر توفیق ٧: ٦١–٧٥).

## ١ـ ئەلفبێیەکەی جەلادەت بەدرخان و ئەو دەستکارییانەی لەسەر کراون

ئەلفبێیەکەی جەلادەت بەدرخان لە (٣١) تیپ پێك دێت بەم جۆرە:

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| A a | (ئا) | G g | (گ) | N n | (ن) | U u | (و) |
| B b | (ب) | H h | (ه) | O o | (ۆ) | Û û | (وو) |
| C c | (ج) | I i | (-) | P p | (پ) | V v | (ڤ) |
| Ç ç | (چ) | Î î | (ی) | Q q | (ق) | W w | (و) |
| D d | (د) | J j | (ژ) | R r | (ر) | X x | (خ) |
| E e | (ئە) | K k | (ك) | S s | (س) | Y y | (ی) |
| Ê ê | (ێ) | L l | (ل) | Ş ş | (ش) | Z z | (ز) |
| F f | (ف) | M m | (م) | T t | (ت) | | |

هەروەها دوو تیپی تریشی دەستنیشان کردووە کە ئەمانەن:

(ح) H h ، (غ) X x

جەلادەت بەدرخان دەڵێ: لەبەر ئەوەی ئەم تیپانە بەگشتی بەکارنایەن و لە هەندێ دایالێکتدا بەکاردێن، بۆیە بەکارهێنانی ئەم تیپانە بەپێی ئارەزووی داناوە (جەلادەت بەدرخان و روجێ لسکو ٦: ١٩–٢٤).

ئەو دەستکارییەی لەم ئەلفبێیەدا کراوە بریتییە لە زیادکردنی تیپەکانی:

(ڕ) R r ، (ڵ) L l

بۆ نموونە لەلایەن جەمال نەبەزەوە (بڕوانە: حامید فەرەج ١: ٣١–٣٢).

هەروەها زیادکردنی تیپەکانی:

(وێ) Ē ē ، (کی) یان (کێ) K k ، (گی) یان (گێ) G g

لەلایەن گیوی موکریانییەوە (بڕوانە: حامید فەرەج ١: ٣٧–٣٨)، کە هەر دووەکەی کۆتایی لە ڕاستیدا نابن بە فۆنیم چونکە واتا گۆڕ نین، لەبەر ئەوە پێویست بەوە ناکا هێمایان بۆ دابنرێ.

## ٢ـ دەستنیشانکردنی تیپەکانی ئەلفبێ

### أ ـ ژمارەی تیپەکان

بۆ دەستنیشانکردنی ژمارەی تیپەکان پێویستە فونیمە ناسەرەکییەکان (کە پێویست ناکا هێمایان هەبێ لە ئەلفبێدا) لە فونیمە سەرەکییەکان جیا بکەینەوە.
فونیمە ناسەرەکییەکانیش ئەو فونیمانەن کە بە بەر ئەم خاڵانە دەکەون:

١ـ ئەو فونیمانەی دەکەون و بە کەوتنیان واتا ناگۆڕێ.

٢ـ ئەو فونیمانەی لە ناوەڕاستی وشەی سادەدا نایەن.

٣ـ ئەو فونیمانەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تری ئەو دەڤەرانەی کە زمانەکە تێدا بەکاردێت، دەگۆڕێن.

لێرەدا ئەگەر تەماشای فونیمی (ئـ) بکەین، دەبینین لە وشەیێکی وەکو (گوڵاو)دا کەوتووە و بە کەوتنی واتای (ئاو) نەگۆڕاوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەم فونیمە (ئـ) بەهیچ جۆرێ لە ناوەڕاستی وشەیێکی سادەی زمانی کوردیدا نایەت، کەواتە ئەمە فونیمێکی ناسەرەکییە لە زمانی کوردیدا.

دیسان ئەگەر تەماشای ئەو فونیمانە بکەین کە دیاردەی قەڵەوکردن (Velarization یان Palatal-velarization) وەردەگرن، بۆ نموونە:

لە دهۆك دەوترێ (وەڵات)، کەچی لە ئامێدی دەوترێ (وەلات)، یان لە سلێمانی دەوترێ (دووکەڵ)، کەچی لە هەولێر و موکریان دەوترێ (دووکەل)، (ل)ەکەش گۆڕاوە بە (ڕ) و بووە بە (دووکەڕ). هەروەها لە کرمانجی ژووروودا دەوترێ (سۆر) بۆ ڕەنگ، کەچی لە کرمانجی خوارووودا دەوترێ (سوور)، کەواتە هەموو ئەو فونیمانەی دیاردەی

(قەڵـەوكردن) وەردەگـرن كـە ئەمانـەن (ۆ، ڕ، ڵ، گ) فـونيمى ناسـەرەكين لـە زمـانى كورديدا، چونكە لە شوێنێكەوە بـۆ شـوێنێكى تـرى ئـەو ناوچـانەى زمـانى كـوردى تێـدا بەكاردێت، دەگۆڕێن بەبێ ئەوەى واتاكەش لەگەڵ خۆياندا بگۆڕن.

هــەروەها ئەگــەر تەماشــاى ئــەو فونيمانــە بكــەين كــە ديــاردەى ســووككردن (Unaspiration) وەردەگرن، بۆ نموونە:

لە دهۆك دەوترێ (كەو) بە (ك) ێكى سووك، كەچى لە ئـاكرێ دەوتـرێ (كـەو) بـە (ك)ێكى ئاسايى، بۆ هەمان واتا، كەواتە هەموو ئـەو فونيمانـەى ديـاردەى (سـووككردن) وەردەگرن كە ئەمانەن ( كْ، پْ، چْ، تْ) فونيمى ناسەرەكين لە زمـانى كورديـدا، چـونكە ديسان لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكى ترى ئەو ناوچـانەى زمـانى كـوردى تێـدا بـەكاردێت، دەگۆڕێن بەبێ ئەوەى واتاكەش لەگەڵ خۆياندا بگۆڕن (بـۆ زانيـارى زيـاتر لـەبارەى ئـەم دوو دياردەيە بڕوانە: بائيزێ عەمەرى ٣: ٧٤–٧٨).

بەهەمان شێوە ئەگەر تەماشاى وشەيێكى وەكو (خـوون - خـوين - خـوێن) بكـەين، كە يەكەميان لەناو كوردە ئێزدييەكان و دووەميـان لـە دهـۆك و سـێيەميان لـە سـلێمانى بەكاردێت، ئەمە دوو شتمان بۆ ديار دەكات: يەكەميان دەسەلمێنـێ كە دەنگـەكانى (وو، وى، وێ) ئەلوفونى يەك فونيمن يان فونيمێكە كـە لـە قۆنـاغى گۆڕاندايـە. دووەميـشيان دەبينين كە ئەم دەنگانـە لـە شـوێنێكەوە بـۆ شـوێنێكى تـر گـۆڕاون، كەواتـە ئەمانـەش ئەلوفونى فونيمێكى ناسەرەكين لە زمانى كورديدا (بۆ زانيارى زياتر لەم بـارەوە بڕوانـە: بائيز عومەر ئەحمەد ٤: ٢١٥–٢٢٠).

لــەلايێكى تــرەوە دوو فــونيم هــەن كــە لــە ئەلفبێيەكــەى جــەلادەت بەدرخانــدا بەكارهێنانيان بـەپێى ئـارەزوو دانـراوە، فونيمـەكانيش (ح) و (غ)ن. لەبـەر ئـەوەى ئـەم فونيمانـە ئێـستا لـە زمـانى كورديـدا بەشـێوەيێكى بـاش بـەكاردێن، ئێمـە بـە پێويـست

دەزانین کە لە ئەلفبێی کوردیدا تیپیان بۆ هەبێ (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مارف خەزنەدار ٥: ٩–١٥).

## ب ـ هێمای تیپەکان

١ـ بەپێی ئەوەی سەرەوە، ئەلفبێی کوردی پێنج تیپ زیاتر لە ئەلفبێی ئینگلیزی دەگرێتە خۆی، کە تیپەکانی ئەم فونیمانەن (ش، چ، ێ، ح، غ). بە ڕای من دەبێ یەك نیشانە (لەبەر ئاسانی) و لە یەك شوێن (لەبەر جوانی نووسین) بۆ ئەم تیپانە ( x, h, e, c, s) زیاد بکرێ، بۆ وەدەستهێنانی هێمای تیپەکانی هەر پێنج فونیمەکەی سەرەوە و من بەم جۆرە پێشنیاز دەکەم: (x, h, e, c, s).

٢ـ فونیمە ناسەرەکییەکانیش هەر چەندە ناچنە ناو ئەلفبێی کوردییەوە، بەڵام پێویستە هێمایان هەبێ لەبەر ئەم هۆیانە:

أـ بۆ ئەوەی لە شوێنی پێویستدا دابنرێن وەکو (سەر) و (بۆر) و (ژێر)ی عەرەبی و فارسی.

ب ـ بۆ ئەوەی لە لێوکردندا (Pronunciation) بەکاربهێنرێن.

ج ـ بۆ ئەوەی قازانجیان لێ وەربگیرێ لە نووسینی فونیمە عەرەبییەکانی (ص، چ، گ، ڤ، ژ، پ) کە لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا زۆر بڵاون.

هێماکانیش من بەم جۆرە پێشنیاز دەکەم:

( ٧ ): لەسەر هەر تیپێك بۆ دەربڕینی دیاردەی قەڵەوکردن.

( ٨ ): لەسەر هەر تیپێك بۆ دەربڕینی دیاردەی سووککردن.

( ō ): بۆ هەر سێ ئەلوفونی (وو، وی، وێ).

( ? ): کە هێمایێکی جیهانییە بۆ (ئـ).

لێرەدا پێویستە ئەوە بوترێ کە لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکارییە هێمای (O) زیاد دەبێ کە جەلادەت بەدرخان بۆ (ۆ)ی دانابوو. ئێمە ئەم هێمایە بۆ (و)ی ئاسایی دادەنێین، بۆ ئەوەی هێمای (U) بۆ (ئە) دابنێین و هێمای (E) بۆ (ی) تا لە ئەنجامدا هێمای (Î) زیاد ببێ.

کەواتە بە پێشنیازی ئێمە ئەلفبێی لاتینی کوردی بەم جۆرە دەبێ:




وینه

هـەروەها هێمـای فونیمـە ناسـەرەکییەکان و فونیمـە عەرەبییـەکانی نـاو ئـەدەبی کلاسیکی کوردیدا بەم جۆرە دەبن:

### هێمای فونیمە ناسەرەکییەکان و عەرەبییەکان




شایانی باسە کە لێرەدا تـەنیا فـونیمی (ع)ی عـەرەبی دەمێنـێ کـە ئـەویش وەکـو جەلادەت بەدرخان بۆی داناوە دەتوانین لە هەر شـوێنێك بـێ ئـەم هێمایـە (`) لـەجیاتی دابنێین.

## ئەنجام

لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا گەیشتینە ئەوەی کە ئـەلفبێی یـەکگرتووی کـوردی بە تیپی لاتینی لە (٣١) تیپ پێك دێت بەم جۆرە:

a (ئا) b (ب) c (ج) ć (چ) d (د) e (ی) é (ێ) f (ف) g (گ)

h (ه) h (ح) i (ـ) j (ژ) k (ك) l (ل) m (م) n (ن) o (و)

p (پ) q (ق) r (ر) s (س) ś (ش) t (ت) u (ئە) v (ڤ) w (و)

x (خ) x (غ) y (ی) z (ز)

هـەروەها ئـەم هێمایانـەشمان دەستنیـشان کـردووە بـۆ فونیمـە ناسـەرەکییەکانی کوردی و هەنـدێ فـونیمی عـەرەبی کـە ناچـنە نـاو ئەلفبێیەکـەوە: (ﭗ ، ﭺ ، ـ ، ؟)، بـۆ ئەوەی لە شوێنی پێویستدا بەکاربێن.

## سەرچاوەکان

١ـ حامید فەرەج، رێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کـورد، بەغدا، ١٩٧٦.

٢ـ بائیز عمر احمد، فۆنیمێن دایالێکتا کورمانجی یـا ژۆری، گۆڤـاری کـاروان، ژمـارە ٨٨، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ١٩٩٠، ل٩–١٣.

٣ـ بائیزێ عەمـەری، دیـاردێن گرانکـرن و سـڤککرنا دەنگـان د دایالێکتـا سـەری یـا زمانێ کوردیدا، کوڤارا پەیڤ، هژمار ٣٥، چاپخانا هاوار، دهۆك، ٢٠٠٥، ل٧٤–٧٨.

٤ـ بـائیز عومـەر ئەحمـەد، دیـاردا گوهورینـا دەنگـێ (و) د پـەیڤا (خونـدن)ا زمـانێ کوردیدا، کۆواری ئەکادیمی، ژمارە ٤، چاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، هـەولێر، ٢٠٠٦، ل٢١٥–٢٢٠.

٥ـ مـارف خەزنـەدار، پاراسـتنی ئـەدگاری نەتـەوەیی لـە وشـەی فەرهـەنگی زمـانی نووسـینی کوردیـدا، کـۆواری ئـەکادیمی، ژمـارە ٤، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٩–٢٢.

٦ـ جلادت بدرخان و روجیـە لـسکو، قواعـد اللغـة الکردیـة (اللهجـة الکرمانجیـة)، ت: دلاور زنکی، مطابع دار العلم.

٧ـ هوگر طاهر توفیق، الالفباء الکوردیة بالحروف العربیة والحروف اللاتینیة، نشوؤها وتطورها ١٨٩٨–١٩٣٢، دار سپیریز للطباعة والنشر، مطبعة وزارة التربیة، اربیل، ٢٠٠٥.

ملخص البحث

# الابجدية الكردية الموحدة بالاحرف اللاتينية

د. بايز عمر احمد

ابجدية كل شعب تتألف من عدد معين من الحروف.

بينما تختلف عدد حروف الابجدية اللاتينية الكردية من لغوي لآخر، وهذا مايتطلب الى اجراء دراسة علمية بشأنها، لهذا رأينا من الضروري اجراء هذه الدراسة والتي هـي محاولـة علمية لتحديد عدد حروف الابجدية اللاتينية الكردية.

*Abstract*

## Standarized Kurdish Latin Alphabet

**Payiz Umer Ahmad**

Each language has a limited number of alphabetic letters whereas Kurdish linguists are not in accordance that enhanced us to achieve this study as an attempt to set the exactly needed number of Kurdish Latin alphabetic letters.

# Konyonktîv di zimanê kurdî de

*Dr. Hussein Habasch*

**Ev nivîsara pêşkêşî prînsêsan Viyan û Bêrîvanê ye.**

Konjonktîv peyveke latînî ye ((Coniuctivus)). Bi elmanî ((Konjunktiv)), îngilîzî û firansiziya wê ((subjunktive)), ((subjonctif)) (1. Wiktionary, das freie Wörterbuch – Das Wikiwörterbuch. 2. Wikipedia. Internet) û bi rûsî weha tê navandin ((soslagatelnoê naklonenîê)).

Di sê jêderên kurdînivîs de weha dabaşa wateya konyonktîvê hatiye: Qanatê kurdo hemî formên wê bi ((Wextên şertî)) nasandine (5. 199, 201-207)). Kamêran Bedirxan navê ((Raweya bilanî)) (Mode subjonctif) lêkiriye û weha wê dinasîne: Gava kirina ko lêker pêş me dike bi daxwazek an gumanek girêdayî ye, wek: Hey ko ez herim Wanê. Min dixwest ez bêm bat e. Min dive îşev ez herim Siirtê. (3. 32). Peyva bilanî ji „bila" hatiye, ji bilî „bila" bêjeyên din jî hene, dinbine egera peydabûna konyonktîvê. Sadiq Behadîn Amêdî jî du wuşeyên erebî „sîxa înşayî" di berhema xwe de rabekirî (7. 340, 339, 313, û di gelek rûpelên din de).

Bi kurdî min têrmîna latînî wergirt û li gor bilêvkirina kurdî „konyonktîv" nivisî. Di jêderên kurdî de, yên bawer pê kirî, çawa xuyadibe, ta niha navekî standard jê re ne hatiye danan.

Ev têrmîna „konyonktîv" wek ez dibînîm, hemî formên kesandina lêkeran di demên konyonktîvî de digire; û ji aliyê din de jî cihdêra wê ya latînî ji zimanê me re ne biyanî ye.

Di encama lêgerînê de li ser vê mijadê, ez gihîştim vê pênasînê: ***konyonktîv raweya kesandina lêkera ye di morfologiyê de; bi saya wê hevok û demine nû di zimên de peydadibin.***

Konyonktîv ji bona nîşandana daxwaz, mebest, merc (şert), vîn (divê), texmîn, tirs û dudilyê di kurdî de tê bikaranîn (2.197). Armanca her formeke Konyonktîvê bi hûrî di jêderên zimanzanên mezin de hatiye numakirin (2.3.4.7).

Li gor heft jêderên serekîn – ji bilî yên min bi nav ne kirine – yên min di vê bendê de bikaranîne; ev demên konyonktîvî di wan de hatine belavkirin: **Q. Kurdo** heft deman raberdike:

Wextê berê şertî:

- forma yekê: Ez biketama (5.199)
- forma dudiyê: Ezê biketama (5.200)

Wextê wê bê şertî:

- forma yekê: Ez bikevim (5.202-203)

Wextê berê şertî bargiranî:

- forma yekê: Ez ketibûma (5.205)
- forma dudiyê: Ezê ketibûma (5.06)

Wextê wê bê şertî bargiranî:

- forma yekê: Ez ketibim (5.206)
- forma dudiyê: Ezê ketibim (5.207)

Di rûpela 203-a de „Wextê wê şertî dudu di kurmancîda" çawa formeke konyonktîvî hatiye nivisîn, lê ez bawerdikim,

ku ew çewtiyeke çapanî ye, çinkê ew di rûpela 202-an de wek dema tê hatiye jimartin (5.202-203). Di jêdera rûsî de jî ew wek forma dema tê tê. (4.171). Forma dudiyê: Ezê ketibim, li ba C. Bedirxan dibe: Dema tê ya dudiyê (1.137) û di jêderên din de ew ne hatiye. Divê li vê formê bê lêgerandin.

Çerkezê Beko wan li ser pênc deman parvedike:

Dema niha-tê: Ez bikevim (2.197-200)

Dema borî-niha: Ez ketibim (2.200-202)

Dema borî -tê: Ez biketama (2.202-204)

Dema borî: Ez ketibûyama yan ketibûma (2.204-206)

Dema borî –tê ya şertê: Ezê biketama (2.206-208)

Di wergera elmanî de ya pirtûka **Celadet Bedirxan û Roger Lescot** bi awayê jêrîn konyonktîv hatiya nîşandan:

Konjunktiv Imperfekt: (bila) ez biketama (1.122, 1.124)
Konditional 1: Ezê (ez dê) biketama (1.122, 1.125)
Konjunktiv Perfekt: (bila) ez ketibim (1.138)
Konjunktiv Plusquamperfekt: (bila) ez ketibiwama (1.138)
Konditional 2: Ezê (ez dê) ketibiwama (1.138-139)
Konjunktiv Präsens: (bila) ez bikevim (1.143)

Di vir de herdu formên „ Konditional" wek demine xweser hatine, ew ne ketine nav klasifikesiya konyonktîvê.

**Kamêran Bedirxan** karê min asankiriye bi nivisîna xweye kurdîye bedew û bi dîtina têrmînan; wî jî weha ew di berhema xwe <<Rêzana zmanê kurdî>> de rêzkiriye:

Raweya hekînî, dema borî:

- forma 1: Ez biketama (3.42)
- forma 2: Ez dê biketama (3.42)

Raweya bilanî (subjonctif)

- boriya berdest: Ez ketibiwam (3.46)

Dema niha û paş:

- Forma 1: Ez bikevim (3-46)
- Forma 2: Ko ez ketibim (3-46)

Tsûkêrman jî di monografiya xweye taybetî de, ya li ser lêkerên kurdî: >>Oçêrkî kurdskoy grammatikî>> bi vî rengî konyonktivê di dawiya berhemê de dibelehîne:

Konjunktiv 1: Ez bikevim

Dema tê ya 2 (borîya şertî) (bûdûşyê 2, proşêdşyê obûslovlênoê): Ezê biketama

Konjunktiv 2 (konyonktîva dema borî, proşêdşî konyonktiv): Ez biketama

Perfektni Konjunktiv 1: Ez ketibim

Perfektni Konjunktiv 2: Ez ketibûma (7.235)

**Sadiq Behadîn Amêdî** jî li şûna têrmîna konyonktîv <<**demê borî înşayî**>> daniye (6.336…).

Lêgervan konyonktîv li gel hemî cûreyên lêkeran numakiriye.

Di wan jêdrên li jor binavkirî de, ji bilî berhema S.B. Amêdî di hemiyan de peyva <<ketin>> di demên konyonktîvê de bikaranîne, lewma jî karê min hinekê asantir dibe, ku ez zimanê rûsî, elmanî û kurdî bi berhevdim û

hewilbidim formeke kurdî yekbûyî ji wan derxim; **ew bi xwe jî armanca vê nivîsarê ye**.

Peyva <<ketin>> lêkereke nederbaze, yekemîn car E.B. Soan di pirtûka xwe de <<Kurdish Grammar (Grammar of the Kurmanji of Kurdish Language, London 1913) bo herdu zaravên kurmancî; bakurî û başûrî bikaraniye, çawa Q. Kurdo dinivîse (4.193-194), paşe wê cihê xwe di konyonktîvê de girt û kî hat, ew wek mina bikaranî.

Di cuda demên konyonktîvê de ev bêjeyina <<Bila; mila, xwezil, xweskê, kêşka, eger, ger, heger, wekî, ku, gerek, lê…>> berî kirdar cihên xwe di hevokên konyonktîvî de digirin.

**Dema niha-tê** (2.197-200)
Konjunktiv Präsens (1.143)
Dema niho û paşê, forma 1-ê (3.46)
Dema niha-tê, forma sade (4.195)
Wextê wê bê şertî (5.202-203)
Konjunktiv 1 (7. 129, 235)

Ketin bdn* (kev) bdb (ket) raweya fermanî (bikeve)

Ev forma bi raweya fermanî,, bikeve + dawineya cînavên kesanî peyda dibe, yan jî bi saya berlêkera bi + bdn kev + dawîneya cînavên kesanî).

(bila, eger, lê…) **ez bikevim** (bila, eger) tu bikevî (bila, eger)ew bikeve (bila, eger) em, hûn, ew bikevin.

Forma neyînî,
ez nekevim tu nekevî ew nekeve
em, hûn, ew bikevin.

**Dema borî-niha** (2.200-202)
Konjunktiv Perfekt (1.139)
Dema-niha û paşê forma 2-yê (3.46)
Wextê wê bê şertî bargiranî (5.206)
Forma dijwar a konyonktîvê di dema niha de (slojneya forma bûdûşevo vremeni soslogatelnovo naklonenia) (4.198-199)
Perfektini Konjunktiv 1(7.235)

Ew ji parenga (Partizip) keti û bdn ya lêkera bûn + dawîneyên cînavên kesanî peyda dibe (keti+b+im,…î û htd…)
(ketin+bûn)

**ez ketibim** tu ketibî ew ketibe
em, hûn, ew ketibin.

Forma neyînî,

ez ne ketibim tu ne ketibî ew ne ketibe
em, hûn, ew ne ketibin.

**Dema borî-tê** (2.202-204)
Raweya hekînî, dema borî forma 1-ê (3.46) (konditional)
Konjunktiv Imperfekt (1.124)

Wextê berê şertî, forma 1-ê (5.199)
Konjunktiv 2 (7.129-130, 235)

Peydabûna vê formê bi berlêkera bi + bdl + pêşgira taybetî bo dema-borî-tê,-a- + forma taybetî ya cînavên kesanî: (eger ez bi + ket + a + ma). „Navgira" (min ev têrmîna dana; çinkê -a- di vir de ne pêşgir û ne jî paşgir e) -a- dikeve paş kokên lêkerên bi dengdaran temam dibin: bi + ket-a. Ew kokên bi dengdêran dawî tên, tîpa -y- tê berî paşgira -a-: bi + nivîsî + ya. Tîpa –ya-kare bê asîmîlekirin bi dawîneya -î-: binivîsya (7.129-130).

(bila) ez biketama, (bila) tu biketayî (bila) ew biketa
(bila) em, hûn, ew biketana
Forma neyînî, -ne- dikeve şûna -bi- ez neketama û htd…

**Dema borî-tê egerê** (şertî) (2.206-208)
Raweya hekînî, dema borî, forma 2-ê (3.46)
Konditional 1. (1.125-126)
Wextê berê şertî, forma 2-ê (5.200)
Dema tê 2. (boriya egerî. 7.235)

Di vê formê de tenê -ê- (nîşana dema tê) dikeve dawiya kirdar (Subjekt), yan jî -dê- wekî din, peydabûna wê wek ya „dema borî-tê ye"

ezê (ez dê) biketama tuyê (tu dê) biketayî ewê (ew dê) biketa
emê, hûnê, ewê (dê) biketana

Forma neyînî, -ne- dikeve şûna -bi- ezê neketama û htd…

**„Dema borî**

Konjunktiv Plusquamperfekt (1.138)

Dema borî (2.204-206)

Raweya hekînî, dema borî, forma 1-ê (3.42)

Wextê berê şertî bergiranî (4.205)

Perfektnî Konjunktiv 2 (7.235)

Ev forma weha peydadibe: Parenga keti + bdb bû + cînavê kasanî + paşgira taybetî -a-

(bila) ez ketibiwama, tu ketibiwayî, ew ketibiwa, em, hûn, ew ketibwana (1.138)

(bila) ez ketibûyama, yan jî ketibûma û htd…(2.205)

(bila) ez ketibûma, (3.42)

(bila) ez ketibûma, tu ketibûyayî, ew ketibûya, em … ketibûna (4.205)

(bila) ez ketibûma

Forma neyînî, ne ketibûma

Ji vê formê re çawa pêşniyaz asantir e mera „ketibûma" bikarbîne, ji ber ku ziman çiqas pêşva diçin, ewqas bilêvkirina peyvan asantir dibin; pir bêjeyên dijwar cihên xwe nagirin, ew hindadibin.

**„Dema borî egerî, forma 1-ê**

Konditional 2 (1.138-139)

Ev forma di jêdera 2-ê de tune ye

Raweya hekînî, dema borî, forma 2-ê (3.42)
Wextê berê şertî bargiranî (4.205-206)
Di jêdera 7-an de jî ev forma tuna ye.

Di vê formê de tenê -ê- dikeve dawiya kirdar: Ezê, yan jî ez dê

Ezê ketibûma ez dê ketibûma

Ji wan demên li jor xuyakirî numadibe, ku ev formên konyonktîvî cihên xwe di zimanê kurdî (kurmanciya bakurî) de digirin:

**Formên konyonktivî**

1. Dema niha-tê (Konjunktiv Präsens, bi elmanî) (ezbikevim)
2. Dema borî-tê (Konjunktiv Imperfekt) (ez biketama)
3. Dema borî-tê egerî (Konditional 1) (ez biketama)
4. Dema borî-niha (Konjunktiv Perfekt) (ez ketibim)
5. Dema borî (Konjunktiv Plusquamperfekt) (ez ketibûma)
6. Dema borî egerî (Konditional 2) (ezê ketibûma)

Lêkera sade kirin ya derbas demên konyonktivî de:

**Dema niha-tê**

(eger) ez bikim (eger) tu bikî (eger) ew bike
(eger) em, hûn, ew bikin

Raweya neyînî, **ne** dikeve şûna **bi**, dibe ez nekevim, tu nekevî û htd…

**Dema borî-tê**

min bikira te bikira wî/wê bikira
me, we, wan bikira

**Dema borî-tê egerî**

minê (dê) bikira teyê (dê) bikira wî/wê (dê) bikira
meyê, weyê, wanê (dê) bikira

**Dema borî-niha**

min kiribe te kiribe wî/wê kiribe
me, we, wan kiribe

Raweya neyînî, min ne kiribe û htd…

**Dema borî**
min kiribûya te kiribûya wî/wê kiribûya
me, we, wan kiribûya

Raweya neyînî, min ne kiribûya û htd…

**Dema borî egerê**

mine kiribûya   teyê kiribûya   wî/wê yê kiribûya
meyê, weyê, wanê kiribûya

Raweya neyînî, minê ne kiribûya û htd…

Di lêkerên hevedudanî de yên bi saya pêşgiran peydadibin, ew bê berlêkera bi- durust bibin, wek mîna em lêkera **rakirin** (derbas) vejêrin:

**Dema niha-tê**

ez rakim   tu rakî   ew rake
em, hûn, ew rakin

Raweya neyînî, ez ranekim û htd…

Demên mayîn jî her li gor qeyda jor hatiye, dibin.

Lêkerên hevedudanî yên bi saya navdêr, rengdêr, çêdibin, yên mîna: Hindakirin, navdêra hinda wek xwe dimîne, tenê kirin tê guhartin, çawa li jor hatibû:

**Dema niha-tê**

Ez hindabikim û htd…

Eger xwendevanan bêtir zanîn li ser lêkerên din xwestin, ew dikarin wan di jêderên navkirî de bibînin. Konyonktîvkirina hemî lêkerên kurmanciya bakurî ne armanca vê nivîsarê bû. Min xwest ez sxêmakê ji jêderên zimanzanên me yên qedirbilind peydabikim; têrmînên rêzimanî kurdî û yên zimanên din bidim berhev û ji wan têrmînine standard vebjêrim, daku rê asanbibe bo lêgervan, mamosteyên zimên, xwendekar û şagirtan. Eger rajayeke weha bi min hatibe kirin, ezê xwe bextewar bizanim.

Bonn, destpêka şibata 2006-an temam bû

**Jêder**:


1. Çerkes Xûdoyêvîç Bakayêv, Yêzîkî kûrdov SSSR, Îsda. Naûka, Moskva, 1973.
2. Emir Djeladat Bedir Khan und Roger Lescot, Kurdische Grammatik, Bonn 1986.
3. Kamran Bedir-Xan, Rêzana zimanê kurdî, Parîs 1971.
4. K. K. Kûrdoyêv, Grammatika kûrdskovo Yêzîka na matêryalê diyalêktov kurmancî î soaranî, Îsda. Naûka, Moskva, 1978.
5. Qanatê kurdo, Gramera zmanê kurdî, kurmancî-soranî, Weşanên Roja Nû, 1990.
6. Sadiq Behadîn Amêdî, Rêzmana kurdî, kurmanciya jorî û jêriya hevberkirî, Bexda, 1987.

7. Î. Î. Tsûkêrman, oçêrkî kûrdskoy gramatîkî, Moskva, 1962.

Bêguman jêderên min bo vê nivîsarê bikaranîne ne hevên li jor tenê ne. Hemî berhemên zimanzanên dine kurd û kurdologên din min temaşa kirin, lê min ne xwest vî karî bi nivisîna wan girantir bikim.

**Têbînî:** Birek ji vê bendê di roja 24.4.2004-an de bo mamosteyên zimanê kurdî li bajarê Gelsenkirchenê /Elmaniya/ hat xwandin.

*** Pênasîna têrmînan**:

Berlêker : pêşdanî; Präfix
Bdb : bingeha dema borî
Bdn : bingeha dema niha
Konditional : forma egerî (şertî)
Konyonktîv : forma daxwaz; şîyan; raweya bilanî…
Navgir : ew tîpa peyvan bi hev ve girêdide
Pareng : partizip
Paşgir : paşdanî; paşgir; Suffix
Rawe : Modus (latînî); Aussageform; mode (fr.ne.), sîxe (erebî)
Sxêma : pilan; mina
Têrmîn : terminus; musteleh (erebî)

## ملخص البحث

### الربط في اللغة الكردية

د. حسين حبش

يتحدث الباحث عن ادوات الربط في اللغة الكردية، حيث يستعرض المحاولات التي ابداها العلماء كل من قەناتێ كوردۆ، چەركەزێ بەكۆ، كامران بدرخان، صادق بهاءالدين ئاميدي واخرون.

مستعرضاً ارائهم حول ذلك واجراء مقارنة فيما بينهم ومن ثم يسلط الضوء على ادوات الربط في اللغة الكردية من وجهة نظره مقارنة مع ادوات الربط في اللغة الالمانية مستشهداً بأمثلة وجمل في كلتا اللغتين.

*Abstract*

# Conjunctions in Kurdish Language

***Dr. Husain Habash***

The study deals with the Conjunctions in Kurdish Language demonstrating the essays of a group of scholars concerning this subject, that of Qanati Kurdu, Jarkaze Bako, Kamiran Bedirkhan, Sadiq Bahauddin Amedi and others.

Then the ressarcher compares between them and sheds light upon conjunctions in kurdish language comparing them with conjunctions in Germany referring to examples and sentences in both languages.